# زەکاتی ماڵی بازرگانی

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور انفسنا ومن سيئات اعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد الا اله الا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله .

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ال عمران (102)

يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا نساء (1)

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ الاحزاب: (1)

اما بعد /

زەکات مافی خوایە لە ماڵ وساماندا بۆ شایستەکانی و ،دووەمین پایەی سەرەکی ئیسلامیشە دوای نوێژ لە چوار فەرزەکانی ئیسلام. لە ( ٨٢ ) ئایەتدا هاوشان لەگەڵ نوێژدا لە قورئاندا باسکراوە.

ئەو کۆمەڵش کە بەشداری درود وپشتیوانی و چاودێری خوایە، دەبێت یەکی لە

---

( 1 ) ئەمە ( خطبة الحاجة ) یە کە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فێری هاوەڵەکانی دەکرد ( ابن ماجة ) ١/٦٠٩ ـ ٦١٠ و( احمد ) ٥/ ٢٧٢ ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، هەروەها بەشێکی لە ( صحیح مسلم) ٦/١٥٧ بەڕاڤە کردنی ( النووي ) یەوە هاتووە .

سیفەتەکانیان دەرکردنی زەکات بێت، وەکو خوای گەورە دەفەرموویت: وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ التوبة ٧١. واتە: ئیمانداران لە نێوان خۆیاندا پشتیوانی یەکتری دەکەن، فەرمان بە چاکە دەکەن ونەهی لە خراپە دەکەن ونوێژەکانیان بە دروستی ئەنجام دەدەن و ،زەکاتی ماڵەکانیان دەردەهێنن، ئەوانە خوای گەورە درودی خۆی دەرژێنێتە سەریاندا.

لەبەرانبەر ئەمەیشدا، خوای گەورە هەڕەشە دەکات لەوانەی چاوچنۆکی دەکەن لەدەرهێنانی زەکات ودەفەرموویت : وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَّهُم بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ال عمران ١٨٠

واتە : ئەوانەی کە ڕەزیلی دەکەن لەوەی خوا پێیداون، وانەزانن چاک بێت بۆیان بەڵکو شەڕو خراپەیە و،لە ڕۆژی قیامەتیشدا دەبێتە ئاگر وئابلۆقە یان دەدات .

بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمانان ـ بەتایبەتی دەوڵەمەندەکان ـ شارەزایی باشیان لەم بوارەدا هەبێت و،هەر حوکمێک کە تایبەتە بە زەکاتەوە لە ڕۆشنایی قورئان وسوننەت و فەرموودەی زانایانی پێشینانەوە بیزانن ،بێگومان منیش لەم نووسینە مدا نامەوێت باسی زەکات بکەم بەگشتی، چونکە ئەوە باسێکی فراوانە وخوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە فیقهیەکان لەوبارەوە، بەڵکو ئامانجی ئەم کورتە باسە چارەسەرکردنی گرفتێکە کە کاریگەرییەکی ناشەرعی ترسناکی هەیە و،بەتەواوی دژ بەدەقە شەرعییەکان و بەرژەوەندی ئایینی ئیسلامە لەم سەردەمەدا، فەتوای نەبوونی زەکات لە ماڵ وسامانی بازرگانی ( عروض التجارة ) دا، ئێمە لەم کاتەدا سەرسام دەبین چونکە هەموو ئەو بەڵگە شەرعیانە پشت گوێ دەخرێن لە قورئان وفەرموودەوراو بۆ چونی زۆربەی زانایانی ئیسلام لەکۆن ونوێدا وچۆن هەندێ لە دەوڵەمەندەکان گوێ شل دەکەن بۆ فەتوایەک کە جگە لەچەند کەسێکی کەم و،نامو ـ شاذ ـ نەبێت لە درێژایی مێژووی ئیسلام کەسی تر لەو جۆرە فەتوای نەداوە .

ئەمڕۆش لەسەردەمی تەشەنە وبەرفراوانی بزوتنەوەی بازرگانی لەهەموو جیهاندا، زۆر جێگای پرسیارە ئایا چی بەرژەوەندییەک لە لابردنی زەکاتی ماڵی بازرگانی دەبینرێت بۆ ئیسلام و بەو بۆنەیەوە ڕێککەوتنی هەموو زانایان هەر لەهاوەڵانەوە تاکو ئەم ڕۆژە پشت گوێ بخرێت و چاوپۆشی لێ بکرێت، ئەم مەسەلەیە پێویستە بەهەندێ ووردبوونەوەو تێڕامانەوە تەماشا بکرێت لەبەر دوو هۆ :

١ - بۆچونی نەبوونی زەکات لە ماڵی بازرگانیدا بۆچونێکی زۆر نامۆیە وەکو دواتر بەهەندێ شیکراوەیی باسی دەکەین و زانایان بەکۆی ڕا بەرپەرچیان داوەتەوە ،ئیتر چی لەپێشینان وچی لە دواینان بەگشتی. هەروەها دەڵێین بۆچی دەبێت بۆچوونی ( داود )و( وابن حزم الظاهری ) کە ڕێڕەوێکی ڕووکەشییان بووە لە دەقەکاندا، زاڵ بکرێتە سەر سەرجەم زانایانی ئوممەتی ئیسلام دا، لە کاتێکدا کە دژی مەبەستەکانی شەرعیشە لەدەرکردنی زەکاتدا.

٢ - ئەم فەتوایە، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەشێکی زۆر لەبەشەکانی زەکات پەک دەخات ودەیوەستێنێ، چونکە ئاشکرایە کەپیشەی سەرەکی ئەم سەردەمە لەهەموو جیهاندا بەزۆری بازرگانییە، بۆیە ئەگەر بڵێین ماڵی بازرگانی زەکاتی تێدا نییە - لەسەر ڕێڕەوی ڕووکەشێکان - ئەوا هیچ نەبێت **٧٠ ٪** لە ئەسڵی زەکات بنەبڕ دەکرێت، بۆ نمونە: هەر لەم کوردستانە بچوکەی خۆماندا - بازرگان هەیە بە ملیۆنەها دۆلارەوە بازرگانی دەکات، لەوانەیە هێندە پارەی نەقدی نەکەوێتە ماڵ وساڵی بەسەردا تێپەڕێت بۆ ئەوەی زەکاتەکەی دەربهێنێ، بەڵکو پێ دەچێت هەندێک لەوانە قەرزاریش بن چونکە ڕووبەری کارەکەیان لەسەر مایەکەیان فراوانترە .

ئێمەش لەم سەردەمەی غەریبی بەرنامەی خواو هەڵگرانیدا دەبینین بەفەرمانەکانی خواو پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) هەندێکیش هەن بەدوای لاوازترین بەڵگەدا دەگەڕێن بۆ خۆ دەربازکردن لە زەکات، ئاشکرایشە کە ڕێژەی ئەو دەوڵەمەندانەی زەکات دەردەهێنن چەندە کەمن بەرامبەر ئەوانەی کەدەری ناهێنن .

جا لەم کاتە ناسک وهەستیارەدا لە مێژووی ئیسلام نەگونجاوە ولێدانێکە بۆ بەرژەوەندی ئەم

دینه بگەڕێین بەدوای بۆچونی ناكۆك لەگەڵ دەقە شەرعێكان ویەكدەنگی زانایان، هەروەها نەگونجاوە لەگەڵ مەبەستەكانی شەرع ( المقاصد الشرعية ) وە ،دابەزێنن بۆ ئەم واقیعە، كە خۆی بەبێ ئەو جۆرە فەتوایە چەندین لادان وگۆڕین دروست بووە بۆ ئایین تیایدا .

ئێمە ناچارین لەپێناوی دەستنیشان كردنی هەندێ لە نەخۆشیەكانی موسڵمانان لەم سەردەمە باسی ( پەتای ) دەمارگیری بكەین، چونكە مەینەتی ئیسلام بەدەست كەسانێكەوەیە كەبەمێشكی خۆیان بیر ناكەنەوە، بەڵكو بەچاوێكی نوقاوە وە بۆچونی مامۆستا وسەرچاوە فیكرییە كانیان وەردەگرن ئەوەیش نەخۆشینێكی ترسناكە .

مەزن ڕاگرتنی هەر كەسێک و گومان بردن بەوەی كە سوننەتی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) و زانستی سەلەف لەو كەسەدا بەرجەستە بووە ئەوە چڵەپۆی توندڕەوییە ودەمارگیریە ـ نەک مەزهەبی ـ بەڵكو دە ماركیری كەسێتی، ئەگینا چۆن دەبێت یەک كەس هەرچی بۆچونی هەبێت دەربارەی عەقیدەت وشەریعەت هەموو مە سە لە یە ک هەر ڕاست بێت ونەیاری ئەوبە هەموو شێوازێک هەر هەڵە بێت .

ئێمە پێویستمان بەو بنەمایە هەیە كەئیمامی عەلی ( ڕەزای خوای لێ بێت ) پەیڕەوی دەكرد، كاتێک ( الحارث بن حوظ ) پێی ووت : ئایا تۆ وادەزانی ئێمە گومانمان لەوە هەیە ( تەڵحە وزوبێر ) لەسەر حەقن، ئیمام پێی فەرموو :

ئەی حارس تۆ لێت تێكچووە! حەق بەپیاوان ناناسرێت حەق بناسە هەڵگرانی دەناسی .

زەكاتی ماڵی بازرگانیش یەكێكە لەو مەسەلە گرنگانەی كەبەهۆی كاریگەری هەندێ زاناوە بەسەر شوێن كەوتوانیانەوە دروست بووە، بەبێ لێكۆڵینەوەی زانستی .

هەر بۆیە بەئەركی بانگەوازم زانی بۆ ئەم ئیسلامە ئەم چەند لاپەڕەیە بنوسم، بەتایبەتی دوای ئەوە كەبینیم هەندێ لەدەوڵەمەندەكان بە كاریگەری ئەو فەتوایە زەكاتی ئەو ماڵانەی كەبازرگانی پێوە دەكەن دەریان نەهێنا ئەمساڵ.

ڕۆڵی منیش لێرەدا بریتیە لە كۆكردنەوەی قسەی زانایان و بەدواداچونیان لەسەرچاوە

زانستییه جیاجیاکاندا، لەگەڵ هەندێ تێبینی وڕونکردنەوە وزیادەی تردا کە پێویست بووە ئەنجام دراوە .

خوای گەورەش ئاگادارە جگە لە دەرخستنی حەق و بانگەواز بۆ ئەو دینە هیچ مەبەستێکم نەبووە، داواکاریشم لە خوای پەروەردگار لیی وە رکرتبیتین و( الحمد الله الذي هدانا لهذا وما كنا لنهتدي لولا ان هدانا الله )

**باوکی موحه ممه د**

**احسان برهان الدين**

**کەلار ٢٠٠١/١/٥**

**پێناسەی ( العروض التجارية )**

( عروض ) كۆیە، تاكەكەی ( عرض )ە واتە: هەرشتێك جگە لەئاڵتون وزیو لە كە ل وپەل وهەموو بابەتێك شیاو بێت بۆ بازرگانی وەكو : ئامڕاز وجل وبەرگ وخشڵ وئاژەڵ وزەوی وخانوو ... هتد

پێناسەیەكی دیكەی كورتیش هەیە بۆ ماڵی بازرگانی كە بریتیە لە:

( هي مايعد للبيع والشراء بقصد الربح )

واتە: هەموو شتێك ئامادە بكرێت بۆ كڕین وفرۆشتن بەمەبەستی قازانج.[1] .

**بەڵگەكانی واجب بوونی زەكاتی ماڵی بازرگانی**

( زەكاتی ئەو ماڵەی بازرگانی پێوە دەكرێت ( واجب )ە و هیچ گومانێكی تێدا نییە بە پێی ئەم بەڵگانەی كە باسی دەكەین :

**یەكەم : بەڵگەكانی قورئاندا :**

خوای گەورە دەفەرموویت: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ البقرة : ٢٦٧ .

واتە: ئەی ئیمانداران ببەخشن لەو پارە حەڵاڵەی كە دەستتان دەكەوێت و لەوەیشە كەلە خاكەوە بۆمان ڕوواندووون .

ئیمامی بۆخاری لە كتێبی زەكات لە ( صحيح )ەكەیدا سەرباسێكی تەرخان كردووە لە ڕۆشنایی ئەم ئایەتەدا ناوی ناوە ( باب صدقة الكسب والتجارة ) واتە: بەشی زەكاتی قازانج وبازرگانی .

پێشەوا ( الطبری )[1] لە تەفسیرەكەیدا بەرگی **٥** لاپەڕە **٥٥٥ ـ ٥٥٦** دەربارەی

---

(1) بڕوانە : ( مطالب اولي النهی ) بەرگی ب ٢/ ل **٩٦** بەوەرگرتن لە ( فقه الزكاة ) دكتور يوسف القرضاوی **٣١٤/١**

ئەم ئایەتە دەفەرموێت :

ڕاڤەی ئایەتەکە ئەوەیە : زەکات دەربکەن لەو دەستکەوتانەی کەبەحەڵاڵی دەستتان دەکەوێت، بەبازرگانی یان بەپیشەسازی، لەئاڵتون ولەزیو .

لەچەند ڕێگەیەکیشەوە لە ( مجاهد ) ڕیوایەت کراوە ( من طیبات ماکسبتم ) ووتوویەتی : واتە: لە بازرگانیەوە .

پێشەوا ( الجصاص ) لە تەفسیری ( احکام القران ) دا بەرگی **١** لاپەڕە**٥٤٣** دەفەرموێت :

لە کۆمەڵێک لە زانایانی پێشینان ( سلف ) ەوە دەربارەی ئەم ئایەتە هاتووە کەمەبەست لەبازرگانییە ،لەوانە :

( حسن ) و ( مجاهد ) و، ئەم ئایەتە بەگشتی زەکات لە هەموو ماڵێکدا واجب دەکات .

پێشەوا ( ابوبکر بن العربي ) لەتەفسیری ( احکام القران ) بەرگی **١** لاپەڕە **٢٣٥** دەفەرموێت : زانایانمان دەربارەی ( ماکسبتم ) فەرموویانە مەبەست لە بازرگانییە و ( ومما اخرجنالکم من الارض ) مەبەست لە ڕووەکە .

ئەمەو، جگە لەو ئایەتانەی بە گشتی باسی مافی خوا دەکات لەهەموو ماڵێکدا کە مرۆڤ بەدەستی دەهێنێ، وەکو دەفەرموێت وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ الذاريات: ١٩. (وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ) المعارج: ٣٢. (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا) التوبة: ١٠٢

هیچ بەڵگەیەکیش نەهاتووە نەلە کیتاب ونە لە سوننەت ماڵی بازرگانی عەفوو بکات

(1) ناوی ( محمد بن جریر بن یزید )ە پێشەوایەکی کەورە بووە لە مێژووی لێکدانەوەی قورئاندا، نیشتەجێی ( بغداد )بووە، داوای لێکرا ببێت بە قازی بەلام قبوڵی نەکرد ،خاوەن ڕێڕەوێکی فیقهی سەربەخۆ بووە، لەو کتێبانەی نوسیوێتی : ( اخبار الرسل والملوک ) و ( جامع البیان فی تفسیر القران ) لە ساڵی (٣١٠) ک کۆچی دوایی کردووە .

لەم مافە ئاشكرایە، كە زەكاتە وموسڵمان بەدەركردنی خۆی وماڵەكەشی خاوێن دەكاتەوە .

( ابن العربي ) لە ( شرح الترمذي )دا بەرگی ۳ ل (۱۰۴) دەفەرموێت: ( خذ من اموالهم صدقة ) بەگشتی هەموو ماڵێک دەگرێتەوەسەرەڕای جیاوازی جۆرەكانیان وناوەكانیان وبەكارهێنانیان، هەر كەسێک دەیەوێ تایبەتی بكات بەیەک شتەوە دەبێت بەڵگە بهێنێتەوە .[1]

**دووەم / لە سوننەتدا:**

( ابو داود ) و ( الدار قطني ) و ( البزار ) لە ( سمرة بن جندب ) دەگێڕنەوەكە فەرموویەتی: ( اما بعد فان رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) كان يأمرنا ان نخرج الصدقة مما نعده للبيع) واتە: پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمانی پێدەكردین ئەوەی كە بۆ فرۆشتنمان دادەنا زەكاتەكەی دەربهێنن .

( ابو داود ) لەم فەرمودەیە بێ دەنگ بووە، ئاشكرایشە كە لە فەرمووده بێ دەنگ نەدەبوو تاكو نەگونجایە بۆ بەڵگە، ئەم فەرموودەیەیش ئەگەر چی لەسەندەكەیدا لاوازیی تیدایە، بەڵام بەچەند فەرموودەیەكی تر بەهێز دەبێت لەوانە :

( ابو ذر الغفاري ) ڕەزای خوای لێ بێت لە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ( في الابل صدقتها، وفي الغنم صدقتها، وفي البز صدقته ) واتە: حوشتر ومەڕو كەل وپەل، هەریەكەو بەپێی خۆی زەكاتی لێ دەكەوێت .

گومانیش لەوەدا نییە كە هەر ماڵ وكەل وپەلێک بۆ سوودی كەسێتی بێت زەكاتی تیادا نییە، هەر ئەوە دەمێنێتەوە لە نرخەكەیدا بێت ئەگەر بۆ بازرگانی بێت .

---

(1) بڕوانە ( فقه الزكاة ) لەبەرگی ۱ ل ۳۱۵.

ئیمامی ( النووي ) له ( شرح المذهب ) دا دەربارەی ئەم فەرموودەیه فەرموویەتی: ڕیوایەت کراوه لەلایەن ( الدارقطني ) و ( الحاکم ) و (البیهقي) یەو بەسەندی خۆیان، ئیمامی ( الحاکم ) یش به دوو سەنەد ڕیوایەتی کردووه، فەرموویەتی: هەردو ( اسناد )ە که ( صحیح )ن لەسەر مەرجەکانی بوخاری وموسلم له وەرگرتنی فەرموودەدا .

دواتر ( النووي ) فەرموویەتی: ( وفي البز صدقته ) به پیتی ( ز ) [1] هاتووه له هەموو ڕیوایەتەکاندا نەک به ( ر ) ( ابن حجر ) یش دوای ئەوەی به ( ز ) وشەی ( البز )ی یەکلا کردۆتەوه، ئینجا باسی لاوازیی یەکێک لەو ڕێگایانەی کردووه که فەرموودەکەمان پێگەیشتووه، لەبارەی ڕێگەکەی تری فەرموودەکه فەرموویەتی: ( وهذا اسناد لاباس به ) واته: ئەو کەسانەی که له زنجیرەی گەیشتنی فەرموودەکەدان چاکن وخراپ نین. بۆیه ئەگەر چی هەندێ زانا فەرموویانه وشە ( البز ) به ( ر ) هاتووه له ڕیوایەتی ( الحاکم ) دا، وەڵامی ئەوان ئەو قسەی ئیمامی نەوەویه که فەرموویەتی هەموو ئەوانەی ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوه وتویانه به ( ز ) یه واته ( البز ) [2] .

ئەمه جگه لەو فەرمووده گشتی یانەی که باسی زەکات دەکەن له هەموو ماڵێکدا وەکو پێشەوا ( الترمذي ) دەگێڕێتەوه له ب **٣** ل **٩١٥** ی کتێبەکەیدا له پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلــم ) که فەرموویــەتی: ( **ادوا زکاة اموالکم** ) واته: زەکاتی ماڵەکانتان دەربهێنن، بێ جیاوازی له نێوان جۆری ماڵەکاندا، ئەگەرچی ماڵی بازرگانی گشتی تره ،چونکه هەموو ماڵێک دەگرێتەوه که بازرگانی پێوه بکرێت وەکو تۆ وئاژەڵ

---

(1) چونکه هەندێ له (ظاهری ) ی و هاوچەرخەکان دەڵێن وشەی ( البز ) که کەل وپەل دەگرێتەوه وتویانه به ( ر ) دەخوێنرێتەوه واته: ( البر ) بەمانای گەنم .

(2) بڕوانه ( اضواء البیان ) ب 1 ل 498 ـ 499 محمد الامین الشنقیطي .

وبەرووبووم وچەک وکەل وپەل و ... هتد بۆیە ماڵی بازرگانی زیاتر بەری ئەو جۆرە دەقە گشتی یانە دەکەوێت .

**سێیەم ⁄ یەکدەنگی ( اجماع ) هاوەڵانی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) وتابیعییە کان وزانایان لە پێشینان وشوێنکەوتوانیان:**

ـ ( ابو عبید ) [1] بەسەنەدی خۆی لە ( عبد القاري ) دەگێڕێتەوە دەڵێت: ((لەسە ردە می عومەری کوڕی خەتتابدا من لەسەر خەزێنە ( بیت المال ) بووم، جا کاتێک کە مووچەو یارمەتییە کانی دەردەکرد پارەی بازرگانەکانی کۆ دەکردەوە ودەیژماردن، ئەوەی لەوێ بوایە وئەویش لە شتی تردا بوایە یان قەرزبوایە، ئینجا زەکاتی لەهەردوو جۆرەکەی دەردەهێنا )) .

ئەم ڕیوایەتە ( ابن ابی شیبة ) و ( ابن حزم ) گێڕاویانەتەوە و وتوویانە (اسناد)ەکەی ( صحیح )ە [2] ئیمامی شافیعی و ئەحمەد وئەبو عوبەید و ( الدارقطني ) و ( ابن ابی شیبة ) و ( عبد الرزاق ) و ( سعید بن منصور ) لە چەندین ڕێگەوە گێڕاویانەتەوە، کە باوکی عەمری کوڕی حیماس فەرموویەتی: (كنت ابيع الادم والجعاب، فمرّ بى عمر بن الخطاب ( رضى الله عنه ) فقال: اد صدقة مالك، فقلت: يا امير المؤمنين، انما هو الادم. قال قوّمه، ثم اخرج صدقته ) [3] واتە: ( باوکی عەمری کوڕی حیماس پێست وتیردانی دەفرۆشت، عومەری کوڕی خەتتاب بەلایدا تێپەری و پێی فەرموو: زەکاتی ماڵەکەت دەربکەن ئەویش وتی: هیچم نییە تەنها توورەکەی تیرو وپێستی ئاژەڵ نەبێت، جا فەرمووی: بیخەملێنە وبەمەزەندە نرخەکەی

---

(1) ناوی ( القاسم بن سلام البغدادي ) یە لە پێشەوایانی زمانەوانی و ( فقه ) وفەرموودەو مێژووە، خاوەنی نووسینی زۆر وبەناوبانگە، ( اسحق بن راهویه ) دەربارەی فەرموویەتی ( نحن نحتاج اليه وهو لا يحتاج الينا ) واتە: ئێمە پێویستمان بەئەوەو ئەو لە ئێمە بێ نیازە، لەساڵی (٢٢٤) ک وەفاتی کردووە بڕوانە ( البداية والنهاية ١٠ ⁄ ٣٢٠ ) .

(2) (موسوعة فقه عمر بن الخطاب ) ل ٤٥٧ محمد رواسی قلعەجی .

(3) بڕوانە: ( فقه السنة ) ب ١ ل ( ٢٩١ـ ٢٩٢، سید سابق و ( موسوعة فقه عمر ) ل ٤٥٧ ـ ٤٥٨ ) محمد رواسی قلعەجی .

دابنێ وزەکاتەکەی دەربکە .

سەبارەت بەلاواز کردنی ( ابن حزم ) بۆ ( ابو عمرو بن حماس ) وباوکی لەسەنەدەکەیدا کە وتویەتی ناناسرێن [1] شێخ ( احمد شاکر ) کە فەرموودە ناسێکی گەورەی هاوچەرخە فەرموویەتی: هەردووکیان ناسراون وجێگەی متمانەشن .

پێشەوا ( ابن قدامة المقدسي ) لەبەدواداچوونی ئەم فەرموودە لەبەرگی **٣** لاپەڕو **٣٥٥** ی کتێبی ( المغني )دا دەڵێت:

ئەمە بەسەرهاتێکی بەناوبانگە وهیچ کەسێک لەهاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) نکۆڵیان نەکردووە لەوەی کە ماڵی بازرگانی زەکاتی تێدایە . بۆیە بە یەکدەنگی ( اجماع ) دەژمێردرێت، پێشەوا ( ابو عبيد ) لە کتێبی (الاموال) ل **٤٢٥** لە عەبدوڵلا ی کوڕی دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: لە ماڵ وکەل وپەل دا زەکات نییە،مەگەر بۆ بازرگـانی بێت، ( ابن حزم ) دەربارەی ئەم فەرموودەیە وتوویەتی ( صحيح )ە بەهەمان شێوە ( ابو عبيد ) واجب بوونی زەکاتی ماڵی بازرگانی لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە گێڕاوەتەوە [2] .

( عمر بن عبد العزيز ) [3] ڕەحمەتی خوای لێ بێت کاتێک خە لیفە ی موسڵمانان بوو نامەیەکی نووسی بۆ ( زورەیقی کوڕی حەییان ) کە لێپرسراو بوو لە میسر وپێی فەرموو: ( ان انظر من مر بك من المسلمين فخذ مما ظهر من اموالهم، مما يديرون من التجارات من كل اربعين

---

* بەڵکو ( ابن حزم ) بە پێشەوا ( ابو عيسى الترمذي ) یشی وتووە ( مجهول )ە واتە ناناسرێت، تەنانەت پێشەوا ( الذهبي ) دەڵێت ئەو قسەیە شایەنی ئاوڕدانەوە نیە. بڕوانە ( تذكرة الحفاظ ) ب **٣** ل **٣٢٢** .

(2) بڕوانە: ( فقه الزكاة ) ل **٣١٥ ـ ٣٢٠** .

(3) بۆ ماوەی دوو ساڵ و چەند مانگێک خەلیفەی موسڵمانان بوو، لە شاری ( مەدینة ) لەدایک بووە وهەر لەوێش پەروەردە بووە، لەسەردەمیدا خۆشیی وئاسایش لەناو خەڵکدا بلاوبوویەوە، لەدادوەریدا نموونە بووە، ( ميمون بن مهران ) دەیووت: زانایان وەکو قوتابی بوون لای، لەساڵی (١٠١) ک ـ دەڵێن دەرمان خوارد کراو وە فاتی کرد .

دینارا دینارا فما نقص فبحساب ذلك..) (1)

واتە: بڕوانە ئەو موسڵمانانەی کە لە لاتن، لەو ماڵانەی کە بازرگانی پێوە دەکەن لە هەموو (٢٠) بیست ( دینار ) دینارێک وەربگرە چەندیش کەمتر بوو هیچی لێ وەرمەگرە .

ـ چوار پێشەوا گەورەکانی ئیسلام (مالک وابو حنیفة وشافیعی واحمد ) زەکاتیان بەواجب زانیوە لەو بابەتانەی کە بازرگانی پێوە دەکرێت، هەر یەکێ لەو چوار پێشەوایە چەند مەرجێکیان بووە بۆ واجب بوونی زەکات لە ماڵی بازرگانیدا. پاش ئەوەی ڕێککەوتون لەسەر ئەسڵی واجب بوونی، ئەبو حەنیفە بە چوار مەرج ومالک بە پێنج وشافیعی بەشەش مەرج وئەحمەد بە دوو، بەڵام مەرجەکانیان تێکڕا لەم خاڵانەی خوارەوەدا خۆیان دەبیننەوە :

١ ـ ( بلوغ النصاب ) واتە: نرخی ئەوماڵەی بازرگانی پێوە دەکرێت بگاتە ئەو ئاستەی کە شەرع زەکاتی تێیدا واجب کردووە ئەویش (٢٠) مسقاڵ ئاڵتونە کە (٨٥) گرام دەکات، بەڵگەشیان کۆمەڵە فەرموودەیەکی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم ) کە ئێرە جێگەی شیکردنەوەیان نییە

٢ ـ ( حولان الحول ) واتە: تێپەڕ بوونی ساڵێک بەسەر لەژێر دەسەڵات بوونی ماڵەکە، نەک لەسەر هەمان بابەت کەیەکەم جار کڕیوێتی بۆ قازانج، چونکە هەر کەسێک لەسەرەتای ساڵەکەوە ماڵەکەی لە ( نصاب ) زیاتر بوو ولەناو ساڵەکەدا کەمیی کرد ولە کۆتایی ساڵەکە دووبارە گەیشتە ( نصاب ) ئەوە زەکاتی تیادا واجبە، بەڵام ئەگەر لەسەرەتای ساڵ یان لە کۆتاییەکی لەو ئاستە کەمی کرد ئەوە زەکاتی تیادا نییە .

**٣ـ** ( ملک العروض بمعاوضة ) واتە: ئەو ماڵە یان بە کڕین یان بە ماڵێکی

---

(1) بڕوانەدەقی نامەکە بەتەواوی لە ( الموطأ ) ب ١ل **٢٥٥** پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس. .

بەرامبەر بەدەستکەوتبێ. جەماوەری زانایان ـ حەنەفییە کان نەبێت ـ مەرجیان داناوە کە ماڵەکە بەکڕین یان بە شتێکی بەرامبەر بەدەست کەوتبێت، بەڵام ئەگەر بەو دوو ڕێگەیە بەدەست نەکەوت، بۆ نمونە میراتی بوو یان دیاری و ( صدقة ) ومالْی بەرانبەر ( خلع ) [1] بوو، ئەوانە زەکاتیان تیادا نییە تاکو بەنییەتی بازرگانی دەستکاری نەکرێت .

۴ ـ ( نية التجارة حال القنية ) واتە: مەبەست لەو ماڵە ئەگەر سوود وەرگرتنی کەسێتی بێت و بازرگانی نەبێت زەکاتی تێدا نییە با بگاتە ئاستی ( نصاب ) یش بەڵام دواتر ئەگەر نیەتی بازرگانی لێ بهێنێ ئیتر بە ماڵی بازرگانی دەژمێردرێت .

۵ ـ ( الا يصير جميع مال التجارة نقدا في أثناء الحول ) واتە: هەموو ئەو ماڵانەی بازرگانی پێوە دەکرێت نەبێتە پارەی نەقدی و لە ( نصاب ) یش کەمتر بێت چونکە ساڵ ( حول ) کە دەبچڕێت. ( جگە لە شافعییە کان کەسی تر ئەم مەرجەی دانەناوە . )

۶ ـ ( الا تتعلق الزكاة بعين العرض ) واتە: خودی ئەو ماڵە زەکاتی تێدا نەبێت وەکو ئاڵتون و زیوو ئاژەڵ وکشتوکاڵ و .. هتد چونکە ئەو شتانە خۆیان لە خۆیاندا زەکاتیان تیادایە کە بگاتە ئاستی ( نصاب ) زەکاتی دەردەکرێت ،بەڵام ئەگەر زەکاتەکە لە خودی ماڵەکەدا نەبوو وەکو کتێب وکەل وپەل وبابەتی تر لەو حاڵەتە زەکاتی بازرگانی تیادایە ) [2]

۷ ـ (ا) پێشەوا ( ابو جعفر الطحاوي ) [3] دەفەرمووێت: ( ثبت عن عمر وابنه

---

(1) پێناسەی ( خلع ) بریتیە لە جیابوونەوەی پیاو لە ژنەکەی بەرانبەر شتێک کە ژنەکەی دەیدات.

(2) بڕوانە: ( الفقه الاسلامي وادلته ) د. وهبه الزحيلي ل ۷۸۷ ـ ۷۹۰ الفقه على المذاهب الاربعة ب ل ۶۰۶ ـ ۶۱۰ عبد الرحمن الجزيري .

(3) ناوی ( احمد بن سلامة الازدي ) یە سەرکردەی حەنەفییە کان بووە لە میسردا. لە ( طحا ) لە دایک بووە، لەنووسراوەکانی ( شرح معاني الاثار ) و ( بيان السنة ) و ( العقيدة الطحاوية ) لە ساڵی (۳۲۱) ک لە قاهیرە

زكاة عروض التجارة ولا مخالف لهما من الصحابة ) [1] واته: زەكاتی ماڵی بازرگانی بە (سند )ێكی ( صحيح )ەوە لە عومەر وكوڕەكەیەوە هاتووە، وە لە یارانی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم ) كەس بۆچوونی پێچەوانەی ئەوانی نەبووە .

پێشەوا ( ابن المنذر ) دەربارەی زەكاتی ماڵی بازرگانی دەفەرموێت: ( اجمع عامة اهل العلم على وجوب الزكاة فى التجارة ) [2]

واتە: ئەهلی عیلم بە كۆی ڕا ( اجماع ) وتوویانە ئەو ماڵانەی بازرگانی پێوە دەكرێت زەكاتی تێدایە ئەگەر ساڵی بەسەردا تێپەڕێت .

( ابن المنذر ) [3] ئەم یەكدەنگییەی لەزۆرێک لە پێشینانەوە باس كردووە وەكو: ( عمر بن الخطاب وعبد الله بن عمر وعبد الله بن عباس ) وحەوت زانا گەورەكەی مەدینە كە ناسراون بە ( الفقهاء السبعة ) ( سعيد بن المسيب، والقاسم بن محمد، وعروة بن الزبير، وابي بكر بن عبد الرحمن بن الحارث، وخارجة بن زيد، وعبد الله بن عتبة، وسليمان بن يسار ) والحسن البصري، وطاوس بن كيسان وجابر بن زيد، وميمون بن مهران، وابراهيم النخعي، ومالک بن انس، وسفيان الثوري، والاوزاعي، والشافعي، وابو حنيفة و هاوەڵانی، واحمد بن حنبل، واسحاق بن راهويه، وابی ثور، وابي عبيد ) [4]

---

كۆچی دووای كردووە. بڕوانە ( اغاثة اللهفان ٢٢٦ ).

(1) بڕوانە: ( المفصل فى احكام المراة والبيت المسلم ) ب ١ ل ٣٨٦ .

(2) ( مجموع الفتاوى ) شيخ الاسلام ابن تيمية ب ١٣ ل ١٣.

(3) یەكێكە لە زانا هەرە گەورەكان، دەربارەی ناكۆكی زانایان كتێبی داناوە، كەكەس نەیتوانیوە لەو شێوە بنووسێت بەڕادەیەک پێویستی بە نووسینەكانی هەیە، دۆست ونەیار هانایان بۆ بردووە، لەساڵی (٣١٠) ک لە دنیا دەرچووە. بڕوانە ( طبقات الفقهاء للشيرازي / 118 ) .

(4) ئەم ( اجماع )ە لە كتێبی ( المجموع شرح المذهب ) النووی وكتێبی ( المغنی ) ابن قدامة المقدسی باس كراوە، بڕوانە: ( اضواء البيان ) ب 1 ل 498 .

ـ ئیمامي بوخاری [1] : لە ( صحیح )ەکەیدا لە بارەی ( صدقة )ی قازانج وبازرگانی تەنها ئەم ئایەتەی باس کردووە کە دەفەرموویت: ( يايها الذين امنوا انفقوا من طيبات ماكسبتم ) .

ـ ابن حجر العسقلاني: لە ڕاڤە کردنی بۆ ئەم مەسەلە دەڵێت: بوخاری بەم شێوازە تەنها ئایەتێکی لەم بارەوە هێناوەتەوە، بەبێ فەرمودە، لەوە دەچێت ئاماژەی بۆ تەفسیری ( مجاهد ) کردبێت بۆ ئەم ئایەتە کە فەرموویەتی ( من طيبات ماكسبتم ) واتە: لە بازرگانی، کە ( الطبري ) و(ابن ابی حاتم ) ڕیوایەتیان کردووە . [2]

ـ پێشەوا موسلیم [3] لە ( ابو هريرة ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (صلی الله عليه وسلم ) عومەری ڕەوانە کردووە بۆ کۆکردنەوەی زەکات ،بەڵام چەند کەسێک قایل نەبوون بەوەی کە بیدەن. یەکێ لەوانە خالیدی کوڕی وەلید بووە، تاکو پێغەمبەر (صلی الله عليه وسلم ) دەفەرمویت ( واما خالد فانكم تظلمون خالدا قد احتبس ادراعه واعتاده فی سبيل الله .. ) واتە / بەڵام خالید ئێوە ستەم دەکەن لە خالید، وا تێدەگەن زەکات نادات، ئەو هەرچی قەڵغانەکان وکەرەستەکانی شەڕی هەیە ( وقف ) ی کردووە لە پێناوی خوادا .

ـ پێشەوا نەوەوی [4] لە ڕاڤە کردنی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرمویت: داوایان لە

(1) سەرکردەی فەرموودەناسان، پێشەواو زانای پایەبەرز ( ابو عبد الله محمد بن اسماعيل بن ابراهيم الجعفی ) لە بوخارا ساڵی (١٩٤) ک لە دایک بووە، زۆر وڵات گەڕاوە بە دوای کۆکردنەوەی فەرموودەدا، خاوەنی ( قضايا الصحابة والتابعين )ە ( التاريخ ) .. و ( الجامع الصحيح ) کەبەڕاسترین کتێب دەژمێردرێت دوای قورئان لە ساڵی (٢٥٦) ک کۆچی دوایی کردووە لە لادێی ( خەرتەنک ).

(2) ( فتح الباری ) ب ٤ ل ٦٢ ابن حجر العسقلانی

(3) ناوی ( مسلم بن حجاج النيسابوري ) یە لە ( نیسابور ) ساڵی (٢٠٤) ک هاتووەتە دنیاوە، هەر لە منداڵی یەوە دەستی داوەتە کۆکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ( صلی الله عليه وسلم ) و ،وڵاتان گەڕاوە بۆ ئەو مەبەستە، ئیمامی بوخاری بینیوە وزانستی لێ وەرگرتووە، ( صحيح مسلم ) دووەم ڕاسترین کتێبە دوای قورئان، ( پاش ئەوەی هەموو ژیانی تەرخان کرد بۆ خزمەتی فەرموودە، لەساڵی (٢٦١) ک وەفاتی کرد.

(4) ناوی ( يحى بن شرف )ە لە لادێی ( نەوا )ی سەربە ( حوران ) لە دایک بووە و،لەساڵی (٦٧٦) ک هەر لەوێ وەفاتی کردووە، زانایەکی گەورە وفەرموودەناسێکی بەناوبانگ بووە، سەرگەورەی ( دار الحديث ) بووە لەسەردەمی خۆیدا، نووسینی گرنگ وبەسوودی زۆرە لەوانە: (الاربعين النووية )، رياض الصالحين، شرح مسلم، تهذيب الاسماء واللغات .. هتد )

خالید کرد زەکاتی چەک وئەسپ وکەرەستەکانی شەڕ دەربکات، چونکە وا گومانیان دەبرد بۆ بازرگانی بێت کە زەکاتی تێدا واجبە، بۆیە خالید پێی وتن زەکات لەسەرم نییە.

هەندێ لە زانایان لەم فەرموودەیەیش بەڵگەی واجب بوونی زەکاتی بازرگانیان دەرهێناوە کە جەماوەری زانایان لە پێشینان وپاشینان ( سلف وخلف ) لەسەر هەمان بۆچوون بوونە.[1]

ـ پێشەوا ( الترمذي )[2] لە بارەی فەرموودەی ( ليس على المسلم في فرسه ولا في عبده صدقة ) ئەمە فەرموودەیەکی ( حسن صحيح )ە، ئەوەش کەلەلای ئەهلی عیلم کاری پێ دەکرێت ئەوەیە کە ئەو ئەسپ ومایینانەی دەلەوەڕێن و، کۆیلەش ئەگەر بۆ خزمەت بێت زەکاتیان نییە، مەگەر بۆ بازرگانی بن لەو حاڵەتەدا لە نرخەکانیاندا زەکات هەیە کاتێک ساڵی بەسەردا تێپەڕیبێت[3]

ـ ئیمامی ( مالک بن انس ) دەفەرموێت: ( وما كان من مال عند رجل يديره للتجارة، ولا ينض لصاحبه منه شئ تجب عليه فيه الزكاة فانه يجعل له شهرا من السنة يقوم فيه ما كان عنده من عروض للتجارة ويحصي فيه ما كان عنده من نقد او عين فاذا بلغ ذلک كله ما تجب فيه الزكاة فانه يزكيه ).

واتە: هەر ماڵێک لای کەسێک بیکرێت بۆ بازرگانی هیچ سودێکیشی نەبێت بۆ خاوەنەکەی زەکاتی تێدایە، ومانگێکی بۆ تەرخان دەکات لە ساڵەکەدا ماڵەکە

---

(1) بڕوانە: ( عارضة الاحوذي شرح صحيح الترمذي ) ب ٣ ل ١٢٢ ـ ١٢٣ ابن العربي المالكي.

(2) ناوی ( محمد بن عيبسى بن سورة )یە، لە پێشەوایانی فەرموودە بووە، قوتابی ئیمامی بوخاری وهەندێک لە مامۆستاکانی بووە، نمونە بووە لە لەبەر رکدندا، لە دانراوەکان ( الجامع الكبيـر ) و ( الشمائل المحمدية ) و (التاريخ) (العلل)لەساڵی (٢٧٩) ک لە دونیا دەرچووە.بڕوانە ( اغاثة اللهفان / ٢٣ ).

(3) بڕوانە: ( الموطا ) ب ١ ل ٢٥٦ مالک بن انس .

دەخەمڵێنێ هەرچی ئاڵتون وزیوو شتی تری هەیە، جا ئەگەر گەیشتە ئەو ئاستەی کە شەرع زەکاتی تێدا دیاری کردووە، زەکاتەکەی دەردەکات .

پێشەوا ( ابن قدامة المقدسي ) [(1)] دەفەرموێت: زەکاتی بازرگانی لای زۆرینەی ئەهلی عیلم واجبە ( ابن المنذر ) فەرموویەتی زانایان ناکۆکی لە نێوانیاندا نەبووە دەربارەی ئەو ماڵانەی بازرگانی پێوە دەکرێت کە زەکاتی تێدایە هەر کاتێک ساڵی بەسەر تێپەڕێت [(2)] شیخ الاسـلام ( احمد بن تيمية )[(3)] دەفەرموێت:

( والائمة الاربعة وسائر الائمة ـ متفقون على وجوبها في عروض التجارة، سواء كان التاجر مقيما او مسافرا وسواء كان متربصا وهو الذي يشتري التجارة وقت رخصها ويدخرها الى وقت ارتفاع السعر او مديرا كالتجارة في الحوانيت، سواء كانت بزا من جديد او لبيس، او طعاما من قوت او فاكهة، او ادم، او خيلا او بغالا، او حميرا، او غنما معلوفة، او غير ذلك فالتجارات هي اغلب اموال اهل الامصار الباطنة كما ان الحيوانات والماشية هي اغلب الاموال الظاهرة ) [(4)]

واتە: چوار پێشەواکان وهە موو زانایانی ئیسلام ـ مەگەر کەسێک لایدا بێت ـ ڕێککەوتوون لەسەر واجب بوونی زەکاتی ماڵی بازرگانی، ئیتر ئەو بازرگانە جێگیر بێت لەشوێنی خۆیدا یان لەسەفەردا بێت ،یان ( متربص ) بێت واتە: ماڵ بکرێت لە

---

(1) ناوی ( موفق الدين بن عبد الله ) یە، لەسەرانی زانستە لەئیسلامدا ، لەسەر ڕێڕەوی حەمبەلی بووە، لە زۆر زانستدا، وەکو: ( فقه ) و ( اصول ) پێشەوا بووە، خاوەنی ( المغني) و ( المقنع ) و چەندین کتێبی ترە لەساڵی (٦٢٠) ک کۆچی دوایی کردووە .

(2) بڕوانە: ( المغنى والشرح الكبير ) ب ٢ ل ٦٢٣، هەروەها کتێبی ( الكافي فى فقه الامام احمد بن حنبل ) ل ٣٥٥ ابن قدامة المقدسى .

(3) ناوی ( تقي الدين احمد بن عبد الحليم بن عبد السلام ) پێشەواو تازەکەرەوە ( شيخ الاسلام ) بووە، لە (حران ) لەدایک بووە لە ساڵی (٦٦١) ک ، لە ( دمشق ) دا پەروەردە بووە، هەر لەوێش وەفاتی کردووە، لەهەموو زانستە ئیسلامییە کاندا پێشەوا بووە، زیاتر لە چوار هەزار نووسراوی هەیە، لەوانە: ( مجموعة الفتاوى ) و ( الايمان ) .. هتد لەساڵی (٧٢٨) ک لە زیندان دا لە ( دمشق ) کۆچی دوای کردووە .

(4) القواعد النورانيه الفقهية ) ل (١١١ ـ ١١٢) ابن تيمية .

کاتی هەرزانی دا وهەڵیبگرێت بۆ کاتی بەرزبووەنەوەی نرخەکەی ،یان ( مدیر ) بێت واتە: بازرگان بێت لەدوکان دا دابنیشێ ئایا بازرگانییە کە ناو ماڵەو کەل وپەل بێت، نۆێ بێت یان لەبەر کراو، یان خواردەمەنی بێت یان میوە، یان پێست یان شتی تر یان قاپ وقاچاغ بێت لەفەخفوری وشتی هاو وێنەی یان ئاژەڵ بێت یان کۆیلە وماین وهێستر وگوێ درێژ، یان مەڕی جۆ وئالیک خۆر بێت، یان هەر شتێکی تر بێت، چونکە زۆری ماڵی شارستانییەکان بازرگانییە، وەکو چۆن ئاژەڵ وولاخ لەو ماڵانەن کە دیارن .

ـ پێشەوا ( ابن قیم الجوزیة ) [1] دەفەرموێت ( ثم انه جعلها في اربعة اصناف من المال وهي اكثر الاموال دورا بين الخلق وحاجتهم اليها ضرورية احدها الزرع والثمار والثانية بهيمة الانعام الابل والغنم والثالث الجوهران اللذان بهما قوام العالم الذهب والفضة الرابع اموال التجارة على اختلافها ) [2]

واتە: پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) لە تەواوی ڕێنمونی بۆ موسڵمانان زەکاتی لە چوار بابەتدا واجب کردووە کە زۆری لەناو خەڵکیدا مامەڵە یان پێ دەکرێت وە پێویستیان زۆرە پێی،

یەکەم ⁄ کشتوکاڵ وبەروبووم،

دووەم ⁄ ڕەشەولاخ و وشتر ومانگا ومەڕ.

سێیەم ⁄ هەردوو ئەو زێڕەی بناغەی ئابووری جیهانی لەسەرە، ئاڵتون وزیو.

چوارەم ⁄ ماڵی بازرگانی بەهەموو شێوەکانی.

---

(1) ناوی ( محمد بن ابی بکر الزرعي ) یە زانایەکی گەورەیە لەسەر ڕێڕەوی ( احمد بن حنبل)، لە (دمشق ) لە دایک بووە، هەر لەوێش وەفاتی کردووە لەساڵی (٧٥١) ک قوتابی ( ابن تيمية) بووە ولە زیندانی ( قلعة ) لە گەڵیدا بووە، نووسینەکانی لە چلەپۆپەدان لە گرنگیدا. وەکو: (اعلام الموقعين، مدارج الساكين، الطرق الحكمية، اغاثة اللهفان ... هتد ).

(2) ( زاد المعاد في هدي خير العباد ) ب ١ ل ١٤٧

ـ پێشەوا ( ابو عبید ) له كتێبی ( الاموال ) لاپەڕە ( **٤٢٩** ) دەفەرموێت موسڵمانان ( اجماع ) یان كردووه بەیەكدەنگ لەسەر واجب بوونی زەكات لەماڵی بازرگانی.. لەگەڵ ئەوەشدا ( ابو عبید ) باسی بۆچونێكی تری كردووه نەیداوەته پاڵی كەسانێكی دیاری كراو، هەر خۆی دەربارەی ئەو بۆچوونه وتوویەتی : ئەو بۆچوونەكەی تر به ڕێڕەوی ئەهلی عیلم ناژمێردرێت .

ـ ئیمامی ( ابن العربي ) [1] له ( شرح الترمذي ) **٣ / ١٠٤** دەفەرموێت:

ـ ( والزكاة واجبة في العروض من اربعـة ادلة، الاول قول الله عز وجـل ( خذ من اموالهم صدقة ) وهذا عام في كل مال على اختلاف اصنافه .. الثاني: ان عمر بن عبد العزيز كتب بأخذ الزكاة من العروض والملأ الملأ والوقت الوقت .. الثالث: ان عمر الاعلى قد اخذها قبله صحيح من رواية انس. والرابع: ان ابا داود ذكر عن سمرة بن جندب ان النبي (( صلى الله عليه وسلم )) كان يأمرنا ان نخرج الزكاة مما نعده للبيع ولم يصح فيه خلاف عن السلف..) [2]

واته: زەكات واجبه له بازرگانیدا به چوار ڕێگە:

١ـ خوای گەورە دەفەرموێت ( خذ من اموالهم صدقة ) واته: لەماڵەكانیان زەكات وەربگرە، ئەوەش به شێوەیەكی گشتی له هەموو جۆرە ماڵ وسامانێكدا..

٢ـ ( عمر بن عبد العزيز ) له ژیانی هەندێ هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) وتابیعییه كان دوای ڕاوێژ و ( استخارة ) حوكمی داوه بۆ ئومەتی ئیسلامی كه ماڵی بازرگانی زه كاتی تیادایه بەو بڕیارەشه هەموو ناكۆكی یەكی بڕی .

---

(1) ناوی ( محمد بن عبد الله بن محمد الاشبيلي )یيه له ( **٤٦٨** ) ك لەدایك بووه، و له ( **٥٤٥** ) ك له دونیا دەرچووه له زانا گەورەكان دێته ئەژمار، لـه نوسراوەكانـی ( عارضة الاحوذي )، ( العواصم من القواصم ) و .. هتد

(2) ( عارضة الاحوذي بشرح صحيح الترمذي ) ب **٣** ل **١٠٤**

**٣ـ** عومەری گەورەش پێش ئەو هەر بڕیاری دابوو کەلە ڕیوایەتی ئەنەسی کوڕی مالیک بە ( سند صحيح ) پێمان گەیشتوە .

**٤ـ** ( ابو داود ) لە ( سمرة بن جندب ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم ) فەرمانی پێدەکردین زەکاتی ئەو شتانە دەربکەین کە بۆ فرۆشتن ئامادەمان دەکرد .

**٥ـ** پێشەوا ( الخطابي ) [1] دەفەرموێت: (( وزعم بعض المتأخرين انه لا زكاة فيها وهو مسبوق بالإجماع ) [2] واتە: هەندێک لە زانا دواینەکان ( المتأخرين ) وتوویانە زەکاتی تیادا نییە. پێچەوانەی ئەو بۆچوونەش پێش ئەوان بە کۆی ڕای زانایان بڕاوەتەوە.

ڕووکەشییە کان ( الظاهرية ) فەرموودەی ( ليس فى عبدك ولا فرسك صدقة ) کردوویانە تە بەڵگە لەسەر نەبوونی زەکات لە بازرگانیدا، جەماوەری زانایانیش وەڵامیان داونەتەوە لە دوو ڕوەوە:

**١ـ** زەکاتی بازرگانی پەیوەستە بەنرخ وبەهاکەیەوە، نەک بەخودی بابەتەکەوە، بۆیە ئەگەر ئەو کەسە نیەتی لەو شتە ئەوە بێت بۆ خۆی هەڵیبگرێت زەکاتی تیادا نامێنێت وخودی ماڵەکەش هەر ماوەتەوە.

**٢ـ** فەرموودەکە بەگشتی کۆیلەو ئەسپ دەگرێتەوە، جا کە سەلمێنرا بەبەڵگە زەکاتی بازرگانی واجبە ئەوە دەبێتە بەڵگەیەکی تایبەت بۆئەو فەرموودە گشتییە وپێشیشی دەخرێت بۆ وەرگرتن وکارپێکردن [3].

---

(1) ناوی ( احمد بن محمد بن ابراهيم البستي )یە یەکێ بووە لەسەرانی زانایان لەزمانی عەرەبی و(فقه ) و وێژەدا ،لە نووسینەکانی ( معالم السنن ) و ( اعلام البخاري ) و ... هتد لەساڵی (188) ک لەنزیک ( کابـول ) وەفـاتی کردووە. ( بڕوانە تذكرة الحفاظ ٣/ ١٠١٨) .

(2) ( معالم السنن ) ب ٢ ل ٢٢٣ الخطابى . بە وەرگرتن لە کتێبی ( فقه الزكاة ) ٣٢٠ـ ٣٢١) .

(3) بڕوانە ( العدة ) حاشية الامير الصنعاني على كتاب ( احكام الاحكام شرح عمدة الاحكام ) ابن دقيق العيد ل ١١٧

پێشەوا ( ابو بكر الحصني ) [1] پاش ئەوەی بەڵگەی ئایەت وفەرموودە دەهێنێتەوە لەسەر واجب بوونی زەكات لە بازرگانیدا دەڵێت: ( البز ) بەو جل وبەرگانە دەووترێت كە بۆ فرۆشتن ئامادە دەكرێت، لای كوتاڵ فرۆشەكان، زەكاتیش لە خودی جل وبەرگدا نییە، بۆیە فەرموودە (صحیح)ە ی كە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم ) تیایدا دەفەرمویێت: (وفی البز صدقتة ) بەوە ڕاڤە دەكرێت كەمەبەست لە جل وبەرگێكە بازرگانی پێوە بكرێت [2] .

ـ ئیمامي ( السندي ) [3] لە ڕاڤە كردنی فەرموودەی ( لیس على المسلم فی عبده ولا فرسه صدقة ) لە ( سنن النسائي ) دا دەڵێت: ئەم دەقە لەسەر كۆیلەیەک وئەسپێک لێكدراوەتەوە كە بۆ بازرگانی نەبێت... بە لام ئەوەی بازرگانی پێوە دەكرێت زەكاتی تێدایە بەو شێوەی لە كتێبەكانی ( فقه ) دا ڕوون كراوەتەوە [4] .

ـ زاناو فەرموودەناسی گەورە، شێخ ( عبد العزیز بن عبدالله بن باز ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەفەرمویێت: ( اما العروض التجارية وهي السلع المعدة للبيع، فانها تقوّم فی اخر العام ويخرج ربع عشر قيمتها، سواء كانت قيمتها مثل ثمنها او اكثر او اقل.. ) [5]

واتە: ماڵی بازرگانی كە ئەو شتانەیە ئامادە دەكرێت بۆ فرۆشتن و،لە كۆتایی

---

(1) ناوی ( تقی الدین ابی بكر بن محمد الدمشقی )یە زانایەكی بەناوبانگ بووە لەسەر ڕێڕەوی ئیمامی شافیعی لەزانایانی سەدەی نۆیەمی كۆچییە .

(2) بڕوانە ( كفاية الاخيار فی حل غاية الاختصار ) ب ١ ل ١٠٩ ابو بكر الحصنی ) .

(3) ناوی (محمد السندی)یە زانایەكی بەناوبانگ بووە لەڕێڕەوی حەنەفیدا.لە( تتة )ی ولاّتی (سند) لەدایک بووە، لەنوسـراوەكانـی ( شـرح الترغیب والترهیب ) و ( ارشاد النقاد الی تیسیر الاجتهاد ) لە ساڵی (١٧٤٩) ز وەفاتی كردووە .

(4) بڕوانە ( سنن النسائی ) ب ٥ ل ٣٥ بشرح السیوطی وحاشیة السندی .

(5) بڕوانە ( مجموع فتاوی سماحة الشیخ عبد العزیز بن عبدالله بن باز ) ب ٥ ل ٢٠. ٢١، ٧٧. ٨٨ د .

ساڵدا دەژمێردرێت چواریەکی دەیەکی لێ دەردەکرێت بۆ زەکات، ئیتر بەهاکەی وەکو نرخەکەی بێت یان کەمتر یان زیاتر... هەروەها ئەم پرسیارەی لێ دەکرێت: (( رجل لديه محلات تجارية بها انواع عديدة من البضائع، كالاقمشة والاحذية والعطورات، فكيف يؤدي زكاتها ؟

الجواب: على من كان لدية سلع للبيع، سواء كانت اقمشة او غيرها، ان يزكي قيمتها اذا حال عليها الحوال مع النقود التي عنده التي قد حال عليها الحول، لما اخرج ابو داود رحمه الله باسناد حسن عن سمرة بن جندب قال: امرنا رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) ان نخرج الصدقة مما نعده للبيع. ولادلة اخرى ذكرها اهل العلم في باب زكاة العروض (3)

واته: کەسێک چەند دوکانێکی بازرگاني هەیە، شتی هەمە جۆری تێدایە وەکو کوتاڵ وپێڵاو و گوڵاو ،چۆن زەکاتەکەی دەربکات؟ شێخ ( ابن باز ) بەم شێوە وەڵامی داوەتەوە:

هەر کەسێک شتی هەبێت بۆ فرۆشتن، کوتاڵ بێت یاشتی تر ،

دەبێت زەکاتی نرخەکەی دەربکات کە ساڵی بەسەردا تێپەڕ بوو، بەبۆنەی ئەو فەرموودەی ( ابو داود ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت گێڕاویەتییەوە..و، لەبەر چەند بەڵگەیەکی تر کە ئەهلی عیلم لە بەشی زەکاتی ( عروض ) دا باسیان لێوە کردووە .

هەروەها پرسیاری لێ کراوە، کەسێک (١٠٠) وشتری هەیە خۆی بە ئالیک بە خێویان دەکات وناله وەڕێن، ئایا زەکاتیان تێدایە؟ لە وەڵامدا فەرموویەتی: ئەگەر وشتر ومانگا ومەڕ نەلەوەڕێن لە زۆربەی ساڵەکەدا لەدەشت ودەر، زەکاتیان تێدا نییە.. مەگەر بۆ بازرگانی بێت، ئەو ئاژەڵانە لەو کاتەدا زەکاتی بازرگانی تێدا دەبێت وەکو چۆن لەزەوی وزار وئۆتۆمبێل وئەو جۆرە شتانە زەکاتی تێدایە

ئەگەر بۆ کڕین وفرۆشتن بێت، ئەگەر نرخەکەیان بگاتە ئاستی ( نصاب )ی ئاڵتون یان زیو [1] .

ـ فەرموودەناس ( احمد شاکر ) [2] لەسەر هەمان بۆچوونی جەماوەری زانایان وفەرمووده ناسان زەکاتی بەواجب زانیوه له بازرگانی دا ( تصحیح ) ی هەندێ لەو فەرموودانەشی کردووه لەو بارەوه و، بەرپەرچی ( ابن حزم )یشی داوەتەوه لەلاواز کردنی هەندێ لەو کەسانەی له ( سند )ی فەرموودەکاندا هاتوون [3] .

لێکدەرەوەی بەناوبانگی قورئان شێخ ( محمد الامین الشنقیطی )[4] دەفەرموێت: ( اعلم ان جماهیر علماء المسلمین من الصحابة ومن بعدهم علی وجوب الزكاة في عروض التجارة، فتقوّم عند الحول ويخرج ربع عشرها كزكاة العين ) واته: ئەوه بزانه که جەماوەری زانایانی موسڵمان له هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) و ئەوانەش دوای ئەوان هاتوون لەسەر ئەوه بوونه که زەکات له بازرگانیدا واجبه، له تێپەڕبوونی ساڵێکدا دەژمێردرێت و زەکاتی دەردەهێنرێت که چواریەکی دەیەکە.

دوای ئەوەی ناوی زۆرێک لەو زانایانه دەبات که ئەو زەکاتەیان بەواجب

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٥١ ( حکم الزکاة فی الابل المعلوفة).

(2) له ساڵی (١٣٠٩) ک له قاهیره لەدایک بووه، خاوەن کۆششێکی گە ورەیه له خزمەتی کتێبەکانی فەرموودەدا، لەساڵی (١٣٧٧) ک وەفاتی کردووه .

(3) بڕوانه ( سنن النسائي ) ب ٥ ل ٣٥ شرح السیوطي وحاشیة السندی .

(4) ناوی ( محمد الامین بن محمد المختار )ە مۆریتانییه لەدایک بووی (١٣٢٠) ک لەبنەماڵەیەکی زانست پەروەربووە بەژن وبەپیاوە،تەنانەت زانستی (نحو، ادب )ی لای خاڵۆژنی خوێندووه لەتەمەنی (١٦) ساڵیدا لەهاوچەرخەکاندا زانایەکی کەم وێنەیە ،له نوسراوەکانی تەفسیری ( اضواء البیان ) که بۆ خۆی قوتابخانەیەکە، له (١٣٩٣ ک ١٩٧٣ ز ) لەشاری مەدینە کۆچی دوایی کردووه بڕوانه ( اضواء البیان 1/ 9 ـ 26 ) .

زانیوه دەڵێت: ( ولا يخفى ان مذهب الجمهور هو الظاهر، ولم نعلم باحد من اهل العلم خالف في وجوب زكاة العروض التجارية الا ما يروى عن داود الظاهري وبعض اصحابه ودليل الجمهور آية: واحاديث: وأثار: وردت بذلك عن بعض الصحابة ( رضوان الله عليهم )، ولم أجد احدا منهم خالف في ذلك، فهو اجماع سكوتي ) (1)

واته: ئاشکرایه که ڕێڕەوی جەماوەری زانایان ڕاسته نازانم کەسێکیش له ئەهلی عیلم پێچەوانەی ئەم بوجوونه ی هەبوو بێت که ماڵی بازرگانی زەکاتی تێدایه، مەگەر ( داود الظاهري) و هاوه لانی نەبێت، بەڵگەی جەماوەری زانایانیش ئایەتێک وکۆمەڵە فەرمووده وشوێنەوارێکه له ڕێگەی هاوەڵانەوه هاتوون، نەزانراوه کەسێکیش له هاوەڵان ناکۆکی لەم بـارەوه کردبێت بۆیــه بەیەکڕایی بێ دەنــگ ( اجماع سكوتي ) دەژمێردرێت، له کۆتایدا دەڵێت:

( هەموو ئەو بەڵگانەی باسمان کرد، وەکو ئەو دوو فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) که له ( ابوذر الغفاري ) و ( سمرة بن جندب )ەوه هاتووه، هەروەها ئەو شوێنەواره ( صحيح )ەی که عومەر زەکاتی پێستی ئاژەڵی له ( حيماس ) وەرگرتووه، ئەوەش که له ( ابن عمر ) ڕیوایەت کراوه و، ئایەتی ( يايها الذين امنو انفقوا من طيبات ماكسبتم ) وتەفسیرەکەی ( مجاهد ) که فەرموویەتی مەبەست له بازرگانی یه، هەروەها کۆی ڕای هەموو زانایان مەگەر کەسێک لایدا بێت له زۆربەی زۆری ئەو زانایانه، هەموو ئەم بەڵگانه بەسن بۆ واجب بوونی زەکاتی بازرگانی .(2)

- شێخ ( سيد سابق ) لەسەر هەمان ڕێبازی زانایان له کتێبه بەناوبانگەکەیدا ( فقه السنة ) باسی واجب بوونی زەکاتی کردووه له

(1) بڕوانه: ( اضواء البيان ..) ب 1 ل 498 .

(2) هەمان سەرچاوه ل ٥٠٠ .

بازرگانیدا وبەشیکراوەیی نمایشی کردووە [1] .

ـ دکتور ( وهبة الزحیلی ) بەدرێژی ئەم واجبەی بۆ موسوڵمانانی ئەم سەردەمە ڕوون کردۆتەوە و یەک بۆچوون بووە لەگەڵ جەماوەری زانایاندا [2].

ـ شێخ ( محمد صالح العثیمین ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت:

ـ (( عروض التجارة: وهي كل ما اعده الانسان للتجارة والربح من أي مال كان، فاذا قدرنا ان رجلا يتاجر بالماشية فهي عروض تجارة، او متاجر بالسيارت فهي عروض تجارة، وكذلك تجارة الاراضي والاقمشة او الساعات وهكذا . المهم ان كل ما اعددته للتجارة فهو عروض تجارة تجب فيه الزكاة ولمعرفة مقدار زكاته، فاننا نقول له: قدر هذا المال اذا تم الحول وانظر كم قيمته ثم اقسم على اربعين فما حصل فهو الزكاة، ولأن عروض التجارة فيها ربع العشر، ووجه ذلك ان الغرض من العروض لا يقصد عين السلعة، فقد يشتري السلعة في الصباح واذا كسب منها اخر النهار فانه يبيعها بخلاف الانسان الذي عنده سلعةللاقتناء فانه سيبقى هذه السلعة ولا يبيعها لان له غرضا في عينها، اما صاحب العروض فغرضه تكثير الاموال باعتبار القيمة، ومن هنا يمكن ان نستدل على وجوب زكاة العروض بقول النبي (صلى الله عليه وسلم ) ( انما الأعمال بالنيات وانما لكل امرئ ما نوى ) فان صاحبه لا يريد الا القيمة في الواقع وعلى هذا فعرض التجارة يضم بعضها، فاذا كان الانسان عنده اقلام واوراق ودفاتر كل واحد منها اذا نظرنا اليه لم يبلغ النصاب لكن بالنظر الى الجميع تبلغ النصاب فيضم .

ولو ان انسانا صاحب تجارة، كان يبيع ويشتري، فاشترى سلعة قبل تمام الحول بعشرة ايام فهل له الا يزكيها الا اذا تم الحول ؟ او نقول زكها اذا تم حول مالك وان لم

---

(1) بڕوانە ( فقه السنة ) ب ١ ل ٢٩١ـ ٢٩٣.

(2) بڕوانە ( الفقه الاسلامي وادلته ) ب ١ ل ٧٨٧ـ ٧٩٠.

يكن لها الا عشرة ايام ؟ فالجواب هو الثاني لان عروض التجارة لا يشترط لها الحول اذا كانت مشتراة بما تم حوله وهذه مسالة تشكل على الناس ولهذا يكثر السؤال عنها ..) (1)

واتە: ماڵی بازرگانی هەموو ماڵێکە مرۆڤ ئامادەی بکات بۆ بازرگانی وقازانج، وەکو: ڕەشە وڵاخ وئۆتۆمبیل وزە ی و زار وکوتاڵ وکاتژمێر ..هتد گرنگ ئەوەیە هەر ماڵێک مەبەســت لێی بازرگانی بێت، زەکاتــی تێدا ( واجب )ە وە بۆ زانینی ئەندازەی زەکاتەکەی، پێی دەڵێن:

ماڵەکە بخەمڵێنە پاش تێپەڕ بوونی ساڵێک و تەماشاکە بایی چەندە؟

بەهاکەی دابەش بکە بەسەر چل دا، ئەوەی کە دەردەچێت زەکاتەکەیەتی، چونکە ماڵی بازرگانی چواریەکی دەیەکی لێ دەکەوێت، لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە ماڵانە مەبەست تیایدا گەشە وزۆر بوونە لەڕووی بەهاکەیەوە، بۆیە دەبینی خاوەنی ئەو ماڵانە مەبەستی لە خودی ئەو ماڵانەدا نییە، لەوانە یە ماڵێک بکڕێت سەر لەبەیانی وبۆ ئێوارە بیفرۆشێت ئەگەر خێری تیادا بێت بۆی، بەپێچەوانەی کەسێک کە ماڵەکە بۆ خۆی بکڕێت، هەر لای دەمێنێتەوە ونایفرۆشێت، چونکە مەبەستی مانەوەی خودی ماڵەکەیە بەڵام خاوەنی ماڵی بازرگانی مەبەستی گەشە پێکردنێتی لەڕووی بەهاکەیەوە، ئا لێرەوە دەکرێت بۆ ( واجب ) بوونی ماڵی بازرگانی، ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) بکەینە بەڵگە کە دەفەرموێت: ( انما الاعمال بالنيات وانما لكل امرئ ما نوى ) چونکە بازرگان لەڕاستیدا تەنها مەبەستی بەهای ماڵەکەیە .

لەسەر ئەم بناغەیەیش، ماڵی بازرگانی تێکڕا دەژمێردرێت ئەگەر کەسێک هەندێکی لە پێنووس وکاغەز ودەفتەر هەبێت، هیچیان بەتەنها نەگەنە ئاستی ( نصاب )، بەڵام تێکڕا بگەن، ئەوا پێکەوە دەژمێرێت وزەکاتی دەردەکرێت، ئەگەر بازرگانێک

(1) ( دروس وفتاوى في الحرم المكي ) للشيخ محمدالصالح العثيمين اعداد: بهاءالدين بن عبدالمنعم ال دحروج .

سەرگەرمی کڕین وفرۆشتن بێت، ماڵێک بکڕێت پێش تەواو بوونی ساڵەکە بەدە ڕۆژ، ئایا پێی دەڵێین زەکاتی لێ ناکەوێت، تا ساڵێک بەسەر خودی ئەو ماڵەدا تێپەڕێت، یا دەڵێین زەکاتی لێ دەکەوێت با تەنها ئەو دەڕۆژەشی بەسەردا تێپەڕیبێ؟ وەڵام بەشێوەی دووەم دەبێت، لەبەر ئەوەی ماڵی بازرگانی مەرج نییە ساڵی بەسەردا تێپەڕێت وهەمان کڕینی هەموو ماڵەکە دادەنرێت، ئەوەش باسێکە لای هەندێ کەس گرفت دروست دەکات، بۆیە پرسیار زۆر دەربارەی دەکرێت .

( ابوبكر الجزائري ) دەڵێت: ( ماڵی بازرگانی یان ( مداراة )ە واتە ئەو ماڵەی بەنرخی ڕۆژ دەفرۆشرێت وچاوەڕوانی بەرزبوونەوەی نرخەکەی لێ ناکرێت، یان ( محتكر )ەکە چاوەڕوان دەکرێت نرخەکەی لە بازاڕ بەرزبێتەوە دوای ئە وە بفرۆشرێت، جا ئەگەر یەکەم بێت نرخی ماڵەکە دادەنرێت و، سەری هەموو ساڵێک ئەگەر گەیشتە ئاستی ( نصاب ) وئەگەریش نەگەیشت وپارەی نەقدی هەبوو بازرگانەکە پێکەوە زەکاتی دەردەهێنێ بە ڕێژەی ٥، ٢٪ . و، ئەگەر دووەم بێت زەکاتی ساڵێکی لە ڕۆژی فرۆشتنی ماڵەکەدا دەردەکات با چەند ساڵێکیش بمێنێتەوە وچاوەڕوانی بەرز بوونەوەی نرخەکەی بکات )

ـ دکتور ( يوسف القرضاوی ) بەشیکراوەیی وتێرو تەسەل باسی واجب بوونی زەکاتی سامان وبازرگانی کردووە، هەروەها بەرپەرچی ڕووکەشییە کان (الظاهریـة )ی لە کۆن ونویدا داوەتەوە لەنامەی دکتۆراکەیدا [1] .

ـ شێخ ( محمد رشيد رضا ) [2] جگە لە بەڵگە شەرعییە کان لێکۆڵینەوەیەکی عەقڵی لەگەڵ ئەوانەدا کردووە کە تەنها لە ڕووکەشی هەندێ فەرموودەوە حوکم

(1) ( فقه الزكاة ) ب ١ ل ٣١٥ و دوای ئەوە .

(2) لەساڵی ( ١٨٦٥ ) ز لە دایک بووە ولە ( ١٩٣٥ ) ز وەفاتی کردووە، لوبنانیە ولەمیسردا ژیاوە، قوتابی شێخ ( محمد عبدە ) بووە، خاوەن گۆڤار وتەفسـیری ( المنار )ە .

وەردەگرن بەبێ سەیر کردنی مەبەستەکانی شەرع وفەرموودەکانی تر لەو بارەوە وبۆچوونی زانایان، لە تەفسیرەکەیدا بەڵگەی هەردوو ڕێگەی واجب بوونی زەکاتی سەلماندووە دەڵێت:

( جمهور علماء الملة يقولون بوجوب زكاة عروض التجارة، وليس فيها نص قطعي من الكتاب والسنة، انما ورد فيها روايات، يقوى بعضها بعضا، مع الاعتبار المسند الى النصوص، وهو ان عروض التجارة المتداولة للاستغلال نقود لا فرق بينها وبين الدراهم والدنانير التي هي اثمانها، الا في كون النصاب يتقلب ويتردد بين الثمن وهو النقد، وبين المثمن وهو العروض، فلو لم تجب الزكاة في التجارة لأمكن لجميع الاغنياء، او اكثرهم ان يتّجروا بنقودهم، ويتحروا الا يحول الحول على النصاب من النقدين ابدا، وبذلك تبطل الزكاة فيها عندهم ) (1) واتە: جەماوەری زانایانی میللەتی ئیسلام دەڵێن: زەکاتی ماڵی بازرگانی واجبە، دەقێکی بڕاوەش نییە دەربارەی بەڕاشکاوی بڵێت ماڵی بازرگانی زەکاتی پێویستە دەربکرێت، بەڵکو هەندێ ڕیوایەت هاتووە پێکەوە یەکتر بەهێز دەکەن، لەگەڵ گرنگی ئەو ئاگادارییەی لە دەقەکان وەردەگیردرێت، ئەویش ئەوەیە ماڵی بازرگانی کە ئەم دەست وئەو دەستی پێوە دەکرێت پارەیەو هیچ جیاوازی نییە لەگەڵ ئاڵتون وزیو کە نرخەکانیانە، ئەوە نەبێت کە ( نصاب ) بان وخوار دەکات لەنێوان ئاڵتون وزیو وپارە ولە لایەکی ترەوە ماڵی بازرگانێکە، جا ئەگەر زەکات واجب نەبوایە لەو ماڵانەدا، دەکرا هەموو دەوڵەمەندان یان زۆربەیان بازرگانی بکەن بەپارەکانیانەوە و، وریاش بن ساڵ بەسەر پارەی نەقدیاندا تێپەڕ نەبێت، بەو شێوازەش زەکاتی تێدا بەتاڵ دەبێتەوە .

- شێخ ( سعید حوی ) دەفەرموێت: هەموو شتێک مرۆڤ بیکڕێت ونیەتی بازرگانی لێ بهێنێ، نرخەکەی مەزەندە دەکرێت وزەکاتی دەردەهێنرێت، زەکاتی

(1) فقه السنه ١/ ٢٩٢

بازرگانیش دەردەهێنرێت لەگەڵ پارەی نەقدا کە هی یەک کەس بن ،جا ئەگەر ساڵێک تێپەڕ بوو لەسەر سەرەتای (نصاب)ەکە یان لەسەر دوا زەکات کە داوێتی ماڵەکانی دەخەملێنێ ودەیخاتە سەر پارەکانی وزەکاتی هەمووی پێوە دەردەکات دوای ئەوەی کە قەرزەکانی لێ لادەبا تەنانەت مارەیی ژنەکەشی ـ بەپێی بۆچوونێکی بەهێزی حەنەفییە کان. [1]

ـ شێخ ( عطية محمد سالم ) دەڵێت: زەکاتی ماڵی بازرگانی یەکێکە لە چوار بنچینەکانی زەکات لەلای هەموو موسڵمانان [2] .

ـ شێخ ( حسن ايوب ) بەوردی بەرپەرچی ڕووکەشییە کان ( الظاهرية )ی داوەتەوەو، سەلماندوویەتی کە بۆچوونەکەیان زۆر نامۆیە ودژ بە بۆچوونی جەماوەری زانایانە[3].

لەڕاستیدا، ئەگەر بێت وئێمە بەدوای هەموو ئەو زانایانەدا بچین کە وتویانە زەکاتی ماڵی بازرگانی واجبە، لەکۆن ونوێدا، ئەوا کار لەوە دەردەچێت لەناملیکەیەکدا یان لە کتێبێک دا یان لەچەندین بەرگیشدا تەواو بێت، بەڵام ئێمە تەنها مەبەستمان بەڕووخستنی بۆچوونی چەند زانایەکی بەناوبانگ بوو لە پێشینان وهاوچەرخەکان، ئەگەر ڕەچاوی ڕێبازی زانستی و(اكاديمی )ش نەکرێت ئاسان ترە بگوترێت: لە درێژایی زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵدا تەنها چەند کەسێک بەزەقی دیارن کە وتوویانە زەکات لەماڵی بازرگانیدا نییە و ئەوانیش: ( داود، ابن حزم الظاهری، محمد بن علی الشوكاني، صديق حسن خان القنوجي، محمد ناصر الدين الالباني ) ن.

---

(1) بڕوانە ( الاسلام ) ب ١ ١٢١ سعيد حوى .

(2) ( اضواء البيان ) ب ٥ ل ٤٤٥، لە درێژە پێدانی تەفسیرەکەی شێخ ( محمد امين الشنقيطی ) پاش کۆچی دوایی .

(3) بڕوانە ( فقه العبادات ) ل ١٣١ حسن ايوب .

**چوارەم: بەڕێگەی پێواندن ( قیاس ) :**

( زانایان ورد بوونەتەوە لە هۆکانی زەکات، بینیانە لە دوو هۆدا خۆی دەبینێتەوە:

١ـ ئەو ماڵە کە گەشەو زیاد بکات لە ڕاستیدا، وەکو تۆو بەروبومی درەخت.

٢ـ یان ئامادە کرا بێت بۆ زیادبوون وەکو ئاڵتون وزیو وئاژەڵ. زانانیان سەیریان کردووە ماڵی بازرگانی هەردوو ئەو خاڵەی تێدایە، بۆیە زۆربەی زۆریان وتویانە هەروەها ئاڵتون وزیویش دەکرێتە بازرگانی بۆ کڕینی بابەتی بازرگانی، بەهەزارەها وملیۆنەها، هەندێ وڵاتیش هەیە زۆربەی دانیشتوانی سەرگەرمی بازرگانین، جا ئەگەر زەکات واجب نەبێت، لەو ماڵ وسامانانە دەبێتە مایەی پەکخستن وهەڵوەشاندنەوەی پایەیەک لەپایەکانی ئیسلام لە گرنگترین جۆرەکانی سامان. زەکاتیش دانراوە بۆ دڵنەوایی ویارمەتی هەژاران وبێنەوایان وزیندوو کردنەوەی ئەو پڕۆژانەی لە پێناوەی خوادا کار دەکەن ولابردنی زەکات لەو ماڵانەی بازرگانی پێوە دەکرێت ) [1]

(( دەولەمەند وبازرگانەکان لەم سەردەمەدا بەبێ ئەوەی مەبەستیان خۆ دزینەوە بێت لە زەکات کەم جار پارەی نەقدیان هەیە ساڵی بەسەردا تێپەڕ ببێت، تەنانەت زۆربەی مامەڵەی بازرگانی ئەمڕۆ بەبێ وەرگرتنی پارە دەبێت لەهەردوولاوە، مەگەر بە ( شیک ) وشتی لەوبابەتە وەکو زانای گەورە (محمد رشید رضا ) دەڵێت: خوای گەورە زەکاتی فەرز کردووە لە پارەی دەوڵەمەندان بۆ دڵنەوایی هەژاران و شایستەکانی تر، هەروەها بۆ ڕاگرتنی بەرژەوەندی گشتی ئایینی ئیسلام وئوممەتەکەی لەوەشدا دەوڵەمەندەکان بەهرەمەندن، خۆیان خاوێن دەکەنەوە لە پیسی وچروکی وڕەزیلی ودەرونیان بە ئاکاری جوان وبەزەیی بۆ هەژاران وجۆرەکانی تریش بەهرەمەند دەبن لەو پارەیە بۆ یارمەتی دانیان لەسەر ناخۆشی ڕۆژان، ئەمە جگە لەوەی ڕێگە لە خراپە وفەساد دەگرێت کە بریتییە لە زۆربوون وپەنگخواردنی لای

---

( 1 ) ( فقه العبادات ) حسن ایوب ل ١٣١ .

خەڵکانێکی کەم.. ( كي لا يكون دولة بين الاغنياء منكم ) .

ئاياعەقڵ ئەمە پەسەند دەکات؟ بازرگانەکان دەربکرێن لە جێبەجێ کردنی ئەم مەبەستە شەرعیانە هەمووی، لەکاتێکدا کەلەوانەیە زۆربەی سامانی ئەم ئوممەتە لای ئەوان بێت )) [1].

لەڕاستیدا جێگای خۆیەتی ئەوە تێبینی بکرێت کە بازرگانەکان لەهەموو کەس زیاتر پێویستیان بەوە هەیە کە خۆیان وپارەکانیان پاک بکەنەوە، چونکە ڕێگەی قازانج کردنیان زۆرجار دوور نییە لە گومان ولێڵی، مەگەر یەکجار خاوەن وەرەع وڕاستگۆو سەر ڕاست بن، ئەوانەش کەمن بەتایبەتی لەم سەردەمەدا .

لە فەرموودەیەکیشدا هاتووە کە ( الترمذي وابن ماجة وابن حبان والحاكم ) ڕیوایەتیان کردووە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی: **(** ان التجار يبعثون يوم القيامة فجارا الا من اتقى الله وبر وصدق **)** واتە: بازرگانەکان بە ( فاجر )ی حەشر دەکرێن تەنها کەسێک نەبێت تەقوای خواو چاکەی کردبێت، ڕاستگۆ بووبێت، ئالێرەدا دەکرێت بووترێت، دەروون وپارەی بازرگان لەهەموو خاوەن پارەیەکی تر زیاتر پێویستی بە خاوێن کردنەوە هەیە.

لەم بارەشەوە ( ابو داود لە ( ابو غرزة ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) بەلاماندا تێپەڕی وفەرمووی ( ئەی کۆمەڵی بازرگانان فرۆشتن قسەی بەتاڵ وسوێندی تێکەڵ دەبێت جا ئەوە بە ( صدقة ) لا بدەن ) [2]

شایەنی ئاماژە بۆ کردنە، یەکێ لەو مەسەلانەی جێگەی باس نەبووە ومشت ومڕو ناکۆکی لەسەر نەبووە لەلای پێشینان ( سلف ) زەکاتی بازرگانی بووە، ئەمە لەکاتێکدا کەلەسەر هەموو شتێکی گەورە وبچوک لە ئایین دا وردبوونەوەو تاوتوێ

---

(1) تەفسیری ( المنار ) ب ١٠ ل **٥٩١**. بەوەرگرتن لە ( فقه الزكاة ) ب **١** ل **٣٢١-٣٢٢** .

(2) ( فقه الزكاة ) ل **٣٢٢** .

زۆریان کردووە ومەسەلەکانیان بە شێوەیەکی زانستی وپشت بەستن بە ئایەت وفەرموودە وشوێنەواری هاوەڵان بڕیوەتەوە، ئیتر چۆن مەسەلەیەکی وەها گرنگ ئەگەر ناکۆکی لەسەر بوایە تێپەڕ دەبوو بەبێ ڕەخنە ورەتکردنەوە، چجای کەنەک ناکۆکی یان نەبووە، بەڵکو ڕێککەوتوون لەسەر واجب بوون وجێبەجێ کردنی، ئەمە جگە لەوەی واتای نەبوونی زەکات لەماڵی بازرگانیدا و ڕەتکردنەوەی ئیجماعی هاوەڵان وتابیعییەکان ئەوە دەگەیەنێ ( سلف ) سەرەڕای نزیک بوونیان لەسەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) وعیلم ودڵسۆزیان لەسەر هەڵەو گومڕایی ڕێککەوتوون: پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت: ( لا يجمع الله امتي على الظلالة ابدا ويد الله على الجماعة ) [1] .

واتە: خوای گەورە ئوممەتەکەم هیچ کاتێک لەسەر گومڕایی کۆ ناکاتەوە، دەستی خواش لەگـەڵ کۆمەڵدایە. یەکدەنگی لـەم بـارەوە ( اجماع ) نەک تەنها لەسەردەمی هاوەڵان وشوێن کەوتوانیاندا دروست بووە ( کە ئەوەش گرنگە ) بەڵکو لەهەموو سەردەمەکانی دوای ئەوانیشدا هـەر دروست بووە جـگە لە کەسانێکی کەم لـە ئەهلی عیلم کـە( ظاهري ) بوونە، یان لەسەر ڕێبازی ئەوان بوونە لەم بوارەدا (( ڕواڵەتی زۆرێک لە ئایەتەکانی قورئان کە دەگاتە ئاستی ( التواتر المعنوي ) وپارێزراوی ئوممەت ڕادەگەیەنن پێکەوە لە هەڵە،(لەگەڵ ئەو فەرموودانەش لەم بارەوە هاتوون ) ڕوون دەبێتەوە بەتەواوی کە ئەو بەڵگانە تێکڕا ئەوە دەگەیەنن یەککدەنگی (اجماع) دەبێتە بەڵگە لە هەموو سەردەمێکدا ) [2] ئێمە نابێت هیچ کاتێک حەق لە ڕێگەی پیاوانەوە بناسین، بەڵام ئەوەش ناگەیەنێت ئێمە لەبەر کەسێکی وەکو: ( داود الظاهري

(1) ئەم فەرموودەیە ( ابن عباس ) لە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەیگێڕێتەوە. ( سند )ەکەی ( صحیح )ە، وەکو ( محمد صبحي حلاق ) دەڵێت: بڕوانە ( الترمذي ) (٤٦٦/٤ ) ژمارە ٢١٦٦، ( الحاكم ١١٦/١) .

(2) بڕوانە ( وبل الغمام على شفاء الاوام ) الشوكاني تحقيق محمد صبحي حسن الحلاق ) ل 72 . ( محمد صبحي حسن الحلاق ) ل 72 .

) كە زانایان خە لكیان لی وریا كردووە تە وە لەبەر ڕێرەوەكەی، هەرچی بەڵگە وبۆچوونی پێشینیان ودواییمنیان ( سلف وخلف ) بدە ین بە دیواردا .

چونكە بەپێی بۆچوونی ( الظاهرية ) لە كۆن ونوێدا زەكات لەبنچینەوە نیمچە نەمانێكی بەسەردا دێت، لەلایەكەوە گەورەترین سامانەكانی دونیا لەم سەردەمەدا بریتین لەو ماڵانەی لە بازرگانی دا دەسوڕێنەوە، بەشی زۆری خاوەن سامانەكان لەم بوارەدا كار دەكەن وقازانج بە دەست دەهێنن، هیچ كاتێكیش ماوەیەک بەسەر هەبوونی بڕێكی زۆر لە پارەی نەقدی لەلایاندا تێناپەڕێت، بە لام خاوەن پارەكانی تر، یان ئەوانەی كە ئاژەڵ داری دەكەن، یان بوارەكانی تر كەوا زەكاتی تیادایە، ئەوانیش بەئاسانی دەتوانن  كاركردنیان بگوێزنەوە بۆ ئەم بوارەی كە باسی دەكەین و،بەم شێوە كەس زەكاتی لەسەر نامێنیَ، ئەمەش لەگەڵ مەبەستەكانی شەریعەتدا ناگونجیَ .

بەڵام خۆش بەختانە زۆرێک لەدەوڵەمەندانی ئەم كوردستانەی خۆمان ؛من بۆ خۆم ئاگادارم بەرپە رچی ئەم بۆچوونەیان داوەتەوە بەبیَ ئەوەی زانستێكی ئەوتۆیان هەبێت، ئەوە نەبێت كە ئیسلام زەكاتی فەرز كردووتە سەر دەوڵەمەندان بۆ هەژاران و بوارەكانی تری خە رجكردنی زەكات .

ئینجا لەبەر ئەوەی ئەم مەسەلە وەكو زانایان باسیان لێوە كردووە ( معلوم من الدين بالضرورة ) واتە: ئاشكرایە لەدیندا و پێویستی  بەبەڵگە هێنانەوە نییە هەر بۆیە زانایان لەهەموو سەردەمەكانی ئیسلام بەبیَ ناكۆكی بەسەریدا تێپەڕیون تا ئەو كاتەی كە ( ظاهرية ) كان بۆچوونە نامۆكەی خۆیان ئاشكرا كرد، ئیتر وا پێویستی كرد زانایان بەرپەرچیان بدەنەوە، پوختەی ئەم بەشەش لەباسەكەماندا ئەوەیە: ئەگەر ( ئێمە زەكاتی ماڵی بازرگانی نەهێڵین وپەكی بخەین، لەكاتێكدا كە بازرگانی گرنگترین دەستكەوتە ئابوریەكانە لەم سەردەمەدا، بەوشێوازە هەژاران بێبەش دەكەین، من دڵنیاشم كە بازرگانە موسڵمانەكان زەكات بەو شێوەیەی كە داوایان لیَ كراوە لەشەرعدا دەری

ناهێنن، چونكه ئەگەر بەو شێوەیە دەربكرایە (هەژار ) نەدەبینرا لە جیهانی ئیسلامیدا ) [1]

(1) ( اختيارات ابن قدامة الفقهية فى اشهر المسائل الخلافية ) د . على بن سعيد الغامدى ل ٥٤٩ .

## ڕووکەشییەکان (الظاهرية ) و زەکاتی بازرگانی

زانیمان کە زەکاتی بازرگانی واجبێکی شەرعییە. بەبەڵگەی چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم )، و چەند شوێنەوارێکی هاوەڵان وڕێککەوتنیان بەبێ ئەوەی نەیارێک هەبوبێت، هەروەها بەبەڵگەی تێکڕای زانایانی پێشینان ودواییینیان. جا با بزانین یەکەم کەس کێ بوو ئەم مەسەلەیەی وروژاندن وجاڕی ئەوەی دا کە ماڵی بازرگانی زەکاتی تێدا نییە؟

لە ڕاستیدا ئەم لادانە لە بناغەوە دەدرێتە پاڵ زانایەک کەناوی ( داود بن علی بن خلف )ە، وەبەلادانەکەشی لە بۆچوونی سەرجەم زانایان، زەمینەی خۆش کرد بۆ ( ابن حزم ) کە دوای زیاتر لە (١٠٠) ساڵ هات ولەسەر قسەکانی ( داود ) ڕێڕەوەکەی خۆی دامە زراند .

داودی کوڕی عەلی لە ساڵی (٢٠٢)ی کۆچی لەدایک بووە، بەبنچینە لە ( ئەصفەهان ) بووە، لە ( بغداد ) پەروەردە بووە و زانستی وەرگرتووە وگوێی لە زۆر زانا وفەرموودەناس گرتووە، کۆچی کردووە بۆ ( نیسابور ) بۆ وەرگرتنی زانستی تەفسیر وفەرمووده لە ( ئیسحاق بن راهویه )، دواتر گەڕاوەتەوە بۆ بەغداد و خە ریکی وە رکرتنی زانستی ( فقه ) بووە بەڵام لە تێگەیشتنی فەرموودەدا لەدەقەکان بەهیچ شێوەیەک لاینەداوە بۆ هیچ واتایەکی تر دەقەکە هەڵیبگرێت، ( داود ) زانستێکی زۆری هەبوو، بەڵام سەرەڕای لێهاتووی لە فەرموودەناسیدا و زیرەکی وتەقوای، کە تەنانەت دیاریشی وەرنەدەگرت لەبەرپرسان، سەرەڕای دەست کورتی ونەداری، (داود ) لەگەڵ ئەم هەموو سیفەتانەی کە هەیبوو، زانایان وفەرموودەناسان خە لکیان لێ وریا دەکردە وە و خۆیان لێ بەدوور دەگرت، ئەوەش لەبەر چەند هۆیەک، لەوانە:

١ـ لەبەر ئەوەی تەنها ڕواڵەتی دەقەکانی وەردەگرت وهیچی تر .

**٢-** زۆر توند وتیژ بوو، هەیبەتی کەسی لە لا نە بوو تەنانەت ( الخطیب البغدادي ) دەگێڕێتەوە: بەڕەقیی بەرپە رچی ( اسحاق بن راهویه )ی داوەتەوە، کە کەس نە پێش ئەو و نە دوای ئەو لە ڕوویدا نەوەستاوە ئەوەندە شکودار بووە .

**٣-** دژایەتی لاسایی کردنەوە ( تقلید )ی دەکرد و دەرگای کۆشش (اجتهاد)ی لەسەر پشت کردبوویە و ە، تا گەیشتە ئەوەی خەڵکی لە خۆیانەوە لە دیندا قسەیان دەکرد .

**٤-** باوەڕی وابوو قورئان دروست کراوە ( مخلوق ) ئەوەش لادانێکی ئاشکرا بوو لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت وجەماعەت، هەر بۆیە ئەحمەدی کوڕی حەمبەل بەهیــچ شێوەیەک ڕازی نەدەبوو پێشوازی لـە ( داود ) بکات وچاوی پێبکەوێت. سەرەڕای هەوڵی زۆری ( داود ) بۆ ئەو چاوپێکەوتنە لەڕێگەی عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەدەوە .

لە ساڵی (**٢٧٠**) ک وەفاتی کردووە و لەناو ماڵەکەی خۆیدا ناشتیان.

پێشەوا ( ابن کثیر ) دەربارەی ڕێڕەوە کورت بینەکەی دەڵێت: ( داود ) لەزانا بەناوبانگەکان بوو، بەڵام ئابلۆقەی خۆی دابوو بەوەی کە پێواندن (قیاس )ی بۆ دەقەکان بەکار نەدەهێنا، بۆیە بیری تەسک بوو لە زۆرێک لە باسەکانی ( فقه )دا، بەهۆی ئەوەشەوە ناچار بوو هەندێ بۆچوونی ڕووکەشی هەبێت لەبەر ئەوەی تەنها تەماشای خودی دەقەکانی دەکرد

بەبێ تێگەیشتنێکی ورد بۆ ماناکانی.[1]

ڕێڕەوی ( ظاهري ) داود، هۆکاری خۆڕاگرتنی تیادا نەبوو ، تووشی ئەگەری تووانەوەش دەبوو، ئەگەر ( ابن حزم ) فووی نە کردایە بە ژیلەمۆی خامۆشی ڕێڕەوەکەیدا، تەنانەت واتای نەبوونی زەکات لە بازرگانیدا، کە لە بنچینەوە لە زاری (

(1) دەربارەی ژیانی ( داود بن علي ) بڕوانە: الخطیب البغدادی ( تاریخ بغداد ) ب **٨** ل **٣٧٣**، (البدایة والنهایة ) ابن کثیر ب ١١ ل **٥٦**، مناهج الاجتهاد فی الاسلام محمد سلام مدکور ل **٧٠٣- ٧١٢** .

داود )ەوە دوونیای بینی، پێش ( ابن حزم )یش کەس گرنگی بەو وتەیە نەدەدا، بەڵکو وەکو نەیارێکیش نەدەژمێردرا وئیجماع هەر ئیجماع بووە سەرەڕای ناکۆکی ( داود ) .

شایەنی باسیشە کە ( ابن حزم ) زانایەکی پایە بەرز بووە وناوبانگی زانستی بەهەموو لایەکدا بڵاوبووە، لەساڵی ( **٣٨٤** ) ک لەدایک بووە ولە ساڵی ( **٤٥٦** ) ک وەفاتی کردووە، باوکی وەزیر بووە لەسەردەمی ئومەوییە کاندا لە ئەندەلوس و دواتر خۆیشی بووەتە وەزیر، بەڵام لەبەر ریزی زانست دەستی لەو پلەو پایە هەڵگرتووەو ،خۆی بۆ زانستە ئیسلامییە کان یەکلا کردۆتەوە.

( ابن حزم ) دوای ئەوەی لەزۆربەی زانیاریە ئیسلامییە کان گەیشتە ئاستێکی بەرز، رووی کردە فقهی ( الظاهري ) وڕێڕەوی ( داود )ی بەتێرو تەسەل وەرگرت، لەگەڵ ئەوەشدا بەرەهایی لاسایی ( تقلید ) مامۆستاکەی نەدەکرد، بەڵکو لە چەند مەسەلەیەکدا لەگەڵیدا ناکۆک بووە، وەکو بیدعەی ( خلق القران ) کە بۆچوونی وەکو مامۆستاکەی نەبووە، بەڵکو دەیووت قورئان قسەو زانینی خوایە لە ڕوی ڕاستییەوە .

ڕێبازی لە دەقە شەرعییەکاندا پشت بەستن بوو بە ڕووکەشی ئەو دەقانە. بۆ نمونە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت: ( الثيب احق بنفسها من وليها، والبكر تستأذن في نفسها واذنها صماتها ) (1)

واتە بێوەژن مافی خۆ بەشوودانی هەیە زیاتر لەخاوەنەکەی، کچی عازەبیش داوای ڕەزامەندی لێ دەکرێت، ڕەزامەندیش لە بێدەنگ بوونیایەتی.

زۆر ئاشکرایە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) هەستی کچانی ڕاگرتووە نەوەک شەرم بکەن ونەتوانن ڕازی بوون دەربڕن.. بۆیە بێدەنگ بوونیان نیشانەی

---

(1) شەش پێشەواکان ـ بوخاری نەبێت ـ ئەم فەرموودەیان لە ( ابن عباس )ەوە گێڕاوەتەوە .

ڕەزامەندییانە بەڵام ( ابن حزم ) لەبەر ئەوەی تەنها سەیری ڕووکەشی دەقەکە دەکات دەڵێت: ( لا يصح ان تزوج الا بالصمات ) واتە: شو کردنەکەی تەواو نییە لە ڕووی شەرعەوە ئەگەر بەدەم بڵێت ڕازیم!! بەڵکو دەبێت بێ دەنگ بێت لەبەر دەقی فەرموودەکە: ( ابن قيم الجوزية ) بەرانبەر ئەم تێگەیشتنە نامۆیە تەنها ئەوەندە دەڵێت: ( وهذا هو اللائق بظاهريته ) [1] واتە: ئەم تێگەیشتنە گونجاوە لەگەڵ کەسێکی ڕووکەشی وەکو ( ابن حزم ) دا .

ئەو سەرەڕای ئەوەی بەم ئەندازە ( ظاهری ) بوو لە ( فقه ) دا، لەباسی ناوو سیفاتەکانی خوای گەورە بە پێچەوانەوە ڕووکەشی دەقەکانی وەرنەدەگرت و( تاويل )ی دەکرد، تەنانەت زانایەکی هاوچەرخی گەورە وەکو شێخ ( محمد ناصرالدين الالباني ) خوا لێی خۆش بێت دەربارەی دەڵێت: (هو فى الصفات جهمي جلد ).

ڕاوبۆچوونی ( داود ) و ( ابن حزم ) وشوێنکەوتوانیان، دەربارەی نەبوونی زەکات لەماڵی بازرگانیدا، لە ڕێگەی چەند شوبهەو گومانێکەوە بۆیان دروست بووە، وەکو:

١- فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) کە بوخاری وموسلیم دەیگێڕنەوە، دەفەرموێت: ( ليس على المسلم فى عبده ولا فرسه صدقة ) واتە: زەکات نییە لە کۆیلە وئەسپی هیچ مووسڵمانێکدا، لەگەڵ فەرموودەیەکی تریش کە هەر ئەم مەعنا دەگەیەنێت.

ڕووکەشی ئەم فەرموودەیە وا دەنوێنێ کەئەو دوو جۆرە لە هەموو کاتێکدا زەکاتی تێدا نییە، چی بۆ سواری بێت یان بۆ بازرگانی .

جەماوەری زانایان وەڵامیان بەرامبەر ئەم گومانە وابووە کە ئەگەر بەوردی سەیری خودی فەرموودەکە بکەیت ئەوەت بۆ دەردەکەوێت کەمەبەستی کۆیلەیەکە بۆ خزمەت

---

(1) بڕوانە ( زاد المعاد ..) ب ۴ ل ۲

بێت وئەسپێکە بۆ سواری بێت، واتە بۆ سوودی کەسێتی نە ک بازرگانی، هەرچی شتێکیش وابێت بە بۆچوونی هەموو زانایان زەکاتی لەسەر نییە.

**٢ـ** هەروەها وتوویانە ( الاصل فی مال المسلم الحرمة ) واتە لە بنچینەوە ماڵی موسڵمان قەدەغە کراوە و پارێزراوە لە دەست درێژی. چۆن دەبێت لەماڵەکانیان وەربگرین بەبێ هیچ بەڵگەیەک لە قورئان وسوننەتدا .

وەڵامیش ئەوەیە لەسەر ئەم خاڵە، زۆر ئایەت هەیە بەگشتی لەهەموو ماڵێکدا زەکاتی دەست نیشان کردووە ئەمە جگە لەو بەڵگە تایبەتانەی زەکات لە ماڵی بازرگانیدا واجب دەکەن، ئەمجا قسەی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) لەوبارەوە و( اجماع )ی سەرجەم ئەهلی عیلم وئەو فەرموودەی پێغەمبەر (صلـی الله علیه وسلم ) کـە ( سمرة بن جندب ) دەگێڕێتەوە و ( ابو داود و المنذري ) بێدەنگ بوونە دەربارەی ئەویش ( حسن ) زانینی فەرموودەکەیە، ( ابن عبدالبر )یش هەر بە ( حسن )ی زانیوە وە شێخ ( احمد شاکر ) یش بەرپەرچی ( ابن حزم )ی داوەتەوە و ،وتویەتی ڕاوی فەرموودەکان جێگەی متمانەن وەکو ( ابن حبان ) لە متمانە پێکراوەکاندا باسیانی کردووە ،ئینجا ئەو فەرموودەیەی ( ابو ذر الغفاري ) گێڕاویەتییەوە و سەنەدەکە شی صە حیحە وەکو ( الحاکم النیسابوري ) فەرموویەتی ( ابن حجر العسقلاني) پشتگیری لێ کردووە .

ئەمانەی باسمان کرد بەڵگە سەرەکییەکانی ڕووکەشییە کانە بۆ ڕەت کردنەوەی واجبی دەرکردنی زەکات لەماڵی بازرگانیدا ئەوانەی کە دوای (ابن حزم ) هاتوون ـ سەرەڕای کەمییان ـ هەمان قسەکانی ئەویان پیت بەپیت دووبارە کردۆتەوە وکەسیشیان بێگومان هێندەی ( ابن حزم ) زانستیان نییە .

پاش کۆچی دوایی ( ابن حزم ) بە زیاتر لە (٧٠٠) ساڵ زانایەکی تری بەناوبانگ وگەورە هات و پشتگیری تەواوی خۆی دەربڕی بۆ بۆچوونەکانی (ابن

حزم ) دەربارەی زەکاتی بازرگانی. ئەو زانایەش پێشەوا ( محمد بن علي الشوكاني ) بوو:

ئەم زانایە لەناوچەی ( هجرة شوكان ) لەیە مە ن لەدایک بووە، و لە (صنعاء) پەروەردە بووە. دواتر بووەتە قاضی لەوێ وکۆچی دوایی کردووە لەهەمان جێگا لە ساڵی (١٢٥٠) ک خاوەنی چەندین کتێبی بەسوودە لەوانە ( نيل الاوطار ) و( فتح القدير ) و ( ارشاد الفحول ) بۆچوونەکەی شەوکانیش لە کتێبی ( الدرر البهية ) بریتیە لەپشت گیری وشوێن کەوتنی تەواوی ( ابن حزم ) وەکو چۆن ( صديق حسن خان ) کە قوتابی شەوکانی بووە، هەمان قسەکانی مامۆستاکەی دووبارە کردۆتەوە لە کتێبی ( الروضة الندية ) ب ١ لا ١٩٢ ـ ١٩٣ بێگومان کە ئیمامی شەوکانی زانایەکی بەرزەو نوسینەکانی لە چڵەپۆپەی نوسینی سەردەمی خۆیدا دێن .

وتەی واجب نەبوونی زەکات لە بازرگانی جگە لە ڕووکەشییە کان (الظاهرية) ودوای ئەوان ( شوکاني وصديق حسن خان ) کەسێکی تری متمانە پێکراو ئەو بۆچوونەی نەبووە لە ڕابردوودا ئەوە نەبێت کە یەکێک لە زانایانی ئەم سەردەمە پشت گیری بۆچوونی ( ابن حزم ) دەکات و وتویەتی لەوە دەچێت ( عطاء بن ابي رباح )یش هەر زەکاتی بەواجب نەزانبێت لە ماڵی بازرگانیدا ،لە درێژایی مێژووی ئیسلامیدا جگە لەمانەی باسمان کرد ـ شیعەکانیش هەمان بیرو بۆچوونیان بووە لەم بارەوە، ئەگەرچی ئەوان لەلایەکی ترەوە ( خمس ) پێنج یەکیان واجب کردووە ئەمەش کە گوترا پێشتر وەکو بەڵگە بو وەڵامی ڕووکەشێکان، دەشێت لەهەمان کاتدا بۆ بەرپەچدانەوەی شیعەکانیش لەم بارەوە، ئە کە رجی هە ر لە بنجینە وە بە ربە رجدانە وە یان زور بیویست نببە.

## زانا هاوچەرخەکان و زەکاتی بازرگانی

باسی زەکات بەگشتی، لەبەر ئەوەی پەیوەستە بە شەرعەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، هەموو باسەکانی بە دەقی قورئان وفەرموودە بڕاو نەتەوە، ئەویش پێویستی بە ڕوونکردنەوە وشیکردنەوە بووە لەسەر دەمی هاوەڵان وشوێنکەوتووانیان دا ئەنجام دراوە، بۆیە کەس بۆی نییە لەو بارەوە پێشنیار بکات یان بڕیار بدات، مەگەر کەسێک سیفەتی لادەر بۆ خۆی مسۆگەر بکات ئینجا بەپێچەوانەی دەقە شەرعییەکان ویەکدەنگی زانایان ـ بە تایبەتی سێ سەدە پڕ خێرەکە ـ هیچ قسەیەک بکات. زانایانی ئەم سەردەمە، وەکو درێژە دانێک بە ڕێبازی ئەهلی سوننەت وجەماوەری زانایان، بەهەمان شێوە یەکدەنگ وبەکۆی ڕا وتویانە، ماڵی بازرگانی دەبێت زەکاتی دەربکرێت بێ جیاوازی لەگەڵ بەشەکانی تردا، ( ئاڵتون وزیو، وکشتوکاڵ وئاژەڵ ) .

چونکە نە شیاوە ئوممەتی ( محمد ) (صلى الله عليه وسلم )، هەموویان لەسەر هەڵەو نەپێکان ـ لە هەموو سەردەمەکاندا ـ هەر یەکڕا وهاو بۆ چوون بن، یەکێکیش لە نیشانەکانی بەزەیی خواو ڕێزگرتنی بۆ ئەم ئەممەتە ئەوەیە، لەسەر هەڵە کۆیانناکاتەوە. ( یُسير بن عمرو )ە وە هاتووە فەرموویەتی، گوێم لە ( ابو مسعود )ی هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) بوو دەیفەرموو: ( عليكم با لجماعة، فان الله لا يجمع امة محمد (صلى الله عليه وسلم ) على الضلالة )[1] .

واتە: یوسەیری کوڕی عەمر وتویەتی گوێم لە ( ابو مسعود بوو دەیفەرموو: خۆتان پابەندکەن بە کۆمەڵەوە چونکە خوای پەروەردگار ئوممەتی محمد (صلى الله عليه

(1) ئەم شوێنەوارە ( ابن أبي عاصم ) لە کتێبی ( السنة ) گێڕاویەتییەوە (١/٤٨ ژمارە ٨٥) ــ شێخ ئەلبانی بە دوایدا وتویەتی ( اسناده جيد موقوف رجاله رجال الشيخين ) واتە: (اسناد)ە کەی چاکە، قسەی ( ابومسعود )ە وپیاوانی سەنەدەکە هەمان پیاوانی سەنەدەکانی بوخاری وموسلم ن، هەروەها ( الطبراني ) و ( ابن ابی شيبة ) ئەم شوێنەوارەیان گێڕاوەتەوە .

وسلم ) لەسەر هەڵەو گومڕایی کۆ ناکاتەوە. لەم سەردەمەی خۆماندا، چەند کەسێک بوونە پشتگیر بۆ بوچوونەکەی ( ابن حزم )، بەناو بانگترین ئەو کەسانەی مامۆستای فەرموودە ناس شێخ (محمد الدين الالباني ) بووە ـ ڕەحمەتی خوای لێبێت ـ لێرەدا بە پێویستی دەزانم بڵێم، کە گومانی تێدا نییە شێخ ئەلبانی زانایەکی پایە بەرزە ولە بواری فەرموودەدا خزمەتی زۆری کردووە، بەڵام ڕێزو خۆشەویستی ئێمە بۆ ئەو زانایە نابێت وامان لێ بکات دەمارگیری مان هەبێت بۆی و وا بزانین هەڵەی لێ ناوەشێتەوە، وەکو هەندێ کەس بەزمانی حاڵ وا دەڵێن و وا گومان دەبەن.

لەم مەسەلەیەشدا شێخ ناصر هیچی تازەی نەوتووە، بەڵکو هەمان قسەکانی ( داود وابن حزم )ی دووپات کردۆتەوە لەگەڵ ئەو زیادانەی شەوکانی وصديق خان خستویانەتە سەر قسەکانی ئەو دووناوبراوە. شێخ لە کتێبی ( تمام المنة فی التعليق علی فقه السنة ) دەڵێت: ( لە ڕاستیدا وتەی هەبوونی زەکات لە ماڵی بازرگانیدا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە لەکتاب وسوننەت، واتە: مرۆڤ لە بنچینەوە بێتاوانە وهیچی لەسەر نییە کە ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله عليه وسلم ) پشتگیری لێ دەکات کە دەفەرموێت لە وتاری ( حجة الوداع ) دا: ( فان دماءكم واموالكم، واعراضكم وابشاركم عليكم حرام، كحرمة يومكم هذا، في شهر كم هذا في بلدكم هذا، هل بلغت ؟ اللهم فاشهد ... ) واتە: خوێنتان، ماڵتان، ناموستان حە رامە لە نێوانی خۆتاندا وەکو حەرامی ئەم ڕۆژە لەم مانگە دا، لەم ناوچەیەی ئێوە، ئایا ئاگادارم کردنەوە، پەروەردگارم شایەت بە. بنەمایەکی ئەوتۆش واتە: (البراءة الاصلية ) هەڵوەشاندنەوەی ئاسان نییە ، یان هیچ نەبێت تایبەت کردنی بە هەندێ شوێنەواری هاوەڵان با ( صحيح )یش بێت، وەکو ئەو فەرموودەی عەبدوڵلای کوڕی عومەر کە دەفەرموێت: ( ليس فی العروض زكاة الا ما كان للتجارة ) واتە: هیچ ماڵێک زەکاتی تێدا نییە مەگەر بۆ بازرگانی بێت، ئەو شوێنەوارە ئیمامی ( الشافعي ) دەگـێڕێتەوە

لــە كتێبی (الام ) بە ( سند ) ێكـی ( صحيح ) و، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە قسەی پێغەمبەر (صلی الله عليه وسلم ) نییە وقسەی یەكێكە لە هاوەڵانی، جگە لەوە باسی ( نصاب ) یشی تێدا نییە، یان بە زەكاتی ڕەها ( مطلق ) لێكبدرێتەوە وپەیوەست نەبێت بە بڕ وبەكاتەوە، بەڵكو ئەوەندەی كە خاوەنەكەی پێی خۆش بێت، بەو شێوەیش ئەو ئایەتە دەیگێڕێتەوە كە بەگشتی باسی زەكات دەكات وەكو: ( يا ايها الذين آمنوا انفقوا مما رزقناكم ) و ( وآتوا حقه يوم حصاده ) هەروەها وەكو ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر (صلی الله عليه وسلم ) كە دەفەرموێت: ( ما من يوم يصبح العبد فيه الا ملكان ينزلان فيقول احد هما: اللهم اعط منفقا خلفا، ويقول الأخر: اللهم اعط ممسكا تلفا ).

ئەم فەرموودەیەش بوخاری ومسلیم دەیگێڕنەوە.

دوای ئەوە شێخ ( ناصر ) بەشێوەیەكی ڕاستەو خۆ دوو بەڵگەی تر لە (عطاء بن ابي رباح)ەوە دەگێڕێتەوە كە وتوویەتی زەكات لە ماڵی بازرگانی دا نییە، مەگەر بفرۆشرێت ولە نرخەكەیدا هەبێت... ئەمجا لە ( ابو عبيد )ەوە دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ( قد حكى عن بعض الفقهاء انه لا زكاة فى التجارة ) (1) .

واتە: ابو عوبە يد لە هەندێ لە زانایانەوە باسی كردووە كە وتوویانە زەكات نییە لەماڵی بازرگانیدا. شێخ ( ئەلباني ) ش بە دووری دەگرێت كە مەبەستی ( داود )

---

(1) لەم بارەوە دەكرێت چوار تێبینی تۆمار بكرێت:

١. وشەی ( حكي ) واتە دەگێڕنەوە، لای زانایان پێی دەوترێت: ( صيغة تمريض ) واتە شتێك گومانی تێدا بێت ئەو جۆرە وشانەی بۆ بەكاردێت وەكو ( حكي، روي، قيل ) وەكو ئاشكرایە .

٢. وشەی (( بعض الفقهاء )) نیشانەیە لەسەر كەمی وناموێیی ئەوانەی كە ئەو بۆ چوونەیان بووە .

٣. مەبەست لە (( بعض الفقهاء )) ( داود ) ە. چونكە نەزانراوە كەسی تر لە زانا گەورەكان ئەو بۆ چوونەیان هەبێت جگە لە ( داود ) لە بەر ئەوەی:

٤. ( ابو عبيد ) خۆی، دەربارەی ئەو بۆچوونە وتوویەتی: ئەوە لە قسەی ئەهلی عیلم نا ژمێردرێت بەلامانەوە وەكو خۆی فەرموویەتی لە كتێبی ( الاموال ) دا ل ٤٢٩ .

بێت، چونکە لەو کاتەدا ( ابو عبید ) وەفاتی کردووە ئەو تەمەنی بست وچوار ساڵێک بووە [1] .

چۆن کەسێک لەو تەمەنەدا خیلافی باس دەکرێت! لە کۆتایی دا دەڵێت: لەوانەیە مەبەستی ( عطاء ) بێت، تاکو دەگاتە ئەوەی دەڵێت:( ابن حزم ) ئەم باسەی بەتێرو تەسەل کردووە و وتوویەتی زەکات لەماڵی بازرگانیدا نییە، بەرپەرچی ئەوانەشی داوەتەوە کە وتوویانە تیایەتی... ڕەخنەی زانستـی وردیشی لـێ گرتوون. لە ( المحلی ) **٦/٢٣٣ـ ٢٤٠** بیخوێنـەرەوە ( چونکە زۆر بەسـوودە ).

پێش ئەوەی کۆتاییش بەمەسەلەکە بهێنێ دەڵێت: لە وانەیە هەندێک بڵێن فەتوای واجب نەبوونی زەکات لە ماڵی بازرگانیدا، ونکردنی سوودی هەژارانی تیادا بێت لە ماڵی دەوڵەمەندان. وەڵامی ئەم قسەیەیش لە دوو ڕووەوە دەبێت:

**١ـ** هەموو شتێک بەدەستی خوایە، کەس بۆی نییە لە خۆیەوە شەرع دابنێ بەبێ مۆڵەت لەخواوە (( وربک یخلق ما یشاء ویختار، ما کان لهم الخیرة، سبحانه وتعالی عما یشرکون )) ئایا نابینی زانایان ڕێککەوتوون لەسەر ئەوەی سەوزی ( خضراوات ) زەکاتی تێدا نییە.

**٢ـ** ئەم قسەیە لەسەر کورت بینی بنیات نراوە، چونکە زەکات تەنها بۆ سوودی هەژاران نییە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ( انما الصدقات للفقراء والمساکین والمؤلفة قلوبهم ...) کەوا بوو هەندێ بە فراوانی سەیری مەسەلەکە بکەین دەزانین کە باوەڕ بە هەبوونی زەکات لە ماڵی بازرگانیدا بەتاڵە ...) [2] .

ئەمانە بوون بەڵگەکانی شێخ ئەلبانی بە ئاسانیش تێبینی دەکرێت بەهێز نین

(1) ئیمامی شافیعی لە (١٥) ساڵیدا، موفتی مەککە لەو سەردەمەدا ( مسلم بن خالد الزنجي ) ئیجازەی فەتوای پێدراوە ولەو تەمەنەدا خەڵکی پرسیاریان لێ کردووە وئەویش فەتوای بۆ داون.

(2) بڕوانە قسەکانی شێخ لە کتێبی ( تمام المنة في التعلیق علی فقه السنة ) ٢٦٢ـ ٢٦٨ .

بەرامبەر بەڵگەکانی جەماوەری زانایان و هە روە ها ( تەکلف )یات پێوە دیارە، وەڵامی هەندێ لەم قسانەی ( شێخ ) با هەواڵەی زانایەکی تری هاوچەرخ بکەین ئەویش شێخ ( یوسف القرضاوي ) یە،کە دەڵێت: ( من باوەڕم نەدەکرد شێخ ئەم قسانە بکات، وام دەزانی هەندێک لە ناحەزانی پڕو پاگەندەی بۆ دەکەن بۆ ناشیرین کردنی لای خەڵکی، تاکو بە چاوی خۆم خوێندمەوە، بازرگانانی ئوممەت ئازاد دەکات لە زەکاتی سامانەکانیان، بەم فەتوایەیشی زۆر شتی پشت گوێ خستووە وڕووی لێ وەرگێڕاوە لەوانە، ئەو ئایەتانەی بەگشتی باسی مافی خوا دەکات لە هەموو ماڵێکدا وزەکاتی تێدا واجب دەکات .

ـ لێکدانەوەی زانایانی ( سلف ) بۆ ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ( وانفقوا من طيبات ما كسبتم ) کە مەبەست لە بازرگانییە .

ـ ئەو فەرموودەیەی کە لە ( سمرة بن حندب ) و ( ابو ذر الغفاري ) یەوە هاتووە، کە هەندێکیان ( ابن عبد البر ) و ( ابن حجر العسقلاني ) یە فەرموودەیەکی ( حسن ) یان زانیوە ( ابو داود و المنذري )یش لێیان بێ دەنگ بووە .

ـ ئەو شوێنەوارەی کە لە عومەر وکوڕەکەی و ( ابن عباس ) ەوە هاتووە لە واجب بوونی زەکات لە ماڵی بازرگانیدا بەبێ ئەوەی هیچ کەسێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) ناکۆکییان لەسەری کردبێت .

ـ هەروەها هەندێ فەرمووده وشوێنەواری بە ( ضعيف ) داناوە کە زانایانی تر بە ( صحيح ) یان زانیوە لە وانە تەنانەت خودی ( ابن حزم ) ومامۆستا (احمد شاكر ) .

ـ هەوڵی داوە گومان دروست بکات لە دەوری ئەو ( اجماع )ە کە پێشەوایان ( البغوي وابن المنذر وابو عبيد والخطابي ) باسیان کردووە. دەربارەی زەکاتی

بازرگانی کە ( واجب ) ە، هەروەها پەنای بردووەتە بەر هەندێ بەڵگەی ( متشابە ) لە یەکچوو وەکو: ( ان اموالکم ودماءکم....) ئەمە فەرموودەیەکە دەست درێژی لەسەر ماڵی خەڵکی ودزی وجەردەیی وستەم قەدەغە دەکات ئەمە لە کوێ وخاوێن کردنەوەی ئەوشتانە لە کوێ بە دەرکردنی زەکات. هەروەها ئەم بەڵگانەی لەم بارەوە هاتوون لەسەر ڕوواڵەتەکەیان لای بردوون سەرەڕای ئەوەی کە خۆی بەلای ڕوواڵەتی دەقدا مەیلی هەیە، وەکو ئەو فەرموودەیەی ( ابن عمر ) کە دەڵێت: مەبەستی لە زەکاتێکی ڕەها ( مطلق )ە پەیوەست نییە بەکات وئەندازەوە، سەرەڕای ئەوەی کە وشەی ( الزکاة ) ئەگەر بەبێ تایبەت کردنی بەشتێکەوە باس بکرێت وەکو لەو فەرموودەیەدا، تەنها مەبەست لە زەکاتە، پێش هەموو ئەمانەش مەسەلەیەکی گرنگی تری پشت گوێ خستووە ئەویش ئەوەیە، شەریعەت هەندێ مەبەست ( مقاصد )ی هەیە دەبێت ئاگاداری بین وجیاوازی ناکات لە نێوان دوو شتی لە یەکچوودا ولە نێوان دوو شتی جیاوازدا یەکسانی ناکات، شتێکی سەیریشە زەکات لەسەر جوتیارو خاوەن ( حوشتر ومانگا وەمەڕ ) واجب بێت ولەسەر خاوەنی سامانە بازرگانی کان واجب نەبێت. ئایا بازرگانەکان پێویستیان بە خاوێن کردنەوەی خۆیان وماڵەکانیان نییە؟ ئایا داوایان لێ نەکراوە سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەو نیعمەتە ویارمەتی هەژاران وپەککەوتووان بدەن وهاوکاری بکەن لە بەرزکردنەوەی ئاینی ئیسلام وبانگەوازەکەی ودڵەکانی لەسەر یەکخەن وەکو غەیری خۆیان؟ ئایا گەنجینەی موسڵمانان پێویستی بەو زەکاتە نییە؟

( شێخ ) خۆی باسی ناڕەزایی دەربڕینی هەندێکی کردووە بەقسەیەکی لەو جۆرە، وەڵامیشی بە دوو شێوە داوەتەوە !

١ـ وتویەتی: هەموو شتێک بەدەستی خوایە... ئەمەیش خۆ دەرباز کردنە لە وەڵام، لەبەر ئەوەی وادەگەیەنێت حوکمەکانی ئیسلام لە مەسەلە دارایی وئابوورێکاندا وشتی لەو

جۆره، ئەوەی کە پەرستش نەبێت، هۆیەکانی نازانرێت ودەشێت کە دژ بەیەکتر بن، شێخ لە زانایانەوە ئەوەشی باس کردووە کە وتوویانە سەوزی ( خضراوات ) زەکاتی تێدا نییە، ئەمەش وانییە ، چونکە ( عمر بن العزيز وابو حنيفة وداود ) لەوەدا زەکاتیان لە هەموو شتێکدا کە لە زەوی بڕوێت بەواجب زانیوە .

سەرگەورەی زانایانی ( مالكي )ش لەسەر دەمی خۆیدا هەر لەسەر ئەم بۆ چوونە بووە لە باسی تەفسیری ( واتوا حقه يوم حصاده ) لە لێکدانەوەی فەرموودەی ( فيما سقت السماء العشر ) واتە: ئەوەی کە ئاسمان ئاوی بدات دەیەکی تیادایە لە زەکات .

٢ـ شێخ پاساوی بۆ بازرگانەکان هێناوەتەوە کە زەکات نەدەن، کار کردن وبازرگانیان بەو پارانەوە سوودی زۆرترە بۆ کۆمەڵ ـ هەژارانیش لە ناو کۆمەڵدان ـ لەوەی کە پارەکانیان گەنجینە بێت و زەکاتی دەربکرێت، وتوویشێتی ئەمە زیاتر پسپۆڕانی ئابووری لێی حاڵی دەبن! ئەگەر ئەم قسەی شێخ وا بوایە دەبوو جوتیارانیش عەفو بکرایەن لە زەکات چونکە گەشە بە زەوی وپارەکەیان دەکەن بە ناشتن و کێلان، سوودیش بەکۆمەڵ دەگەیەنن، هەژارانیش لە کۆمەڵدان، هەروەها ئاژەڵ دارەکانیش چونکە بێگومان ئەوانیش سوود بەکۆمەڵ دەگەیەنن ... ئەو پسپۆڕانەش کە شێخ باسیان دەکات چاک دەزانن کە بازرگانەکان لەسەر تا سەری جیهاندا سەرانەو باجی زۆریان بەسەردا دەسەپێنرێت بۆ بەشداری کردنیان لە گەشە کردنی وڵاتەکانیان وپاراستنی لە ئەستۆگرتنی دەست کورتەکانی، لەبەر ئەوەی ئەوانەی سوود لە کۆمەڵ وەردەگرن بە ڕاستەو خۆ وناڕاستەوخۆ، دەبێت کۆمەڵیش بە هرەمەند بێت لێیان، لەبەر ئەوەی هەموو دەست کەوتێک لەبەرانبەریدا باجێک هەیە. ئەگەر بێت وشارە بازرگانییە گەورەکان بەم فەتوایەی شێخ کار بکەن، بەشی هەژاران وقەرزاران و ( فى سبيل الله ) چی دەبێت لە ملیاراتی ئەوانە. لەو حاڵەتە هیچ ناکەوێتە سەر بازرگانەکانی ( جدة ورياض وكويت ودبى وابوظبى والدوحة والمنامة

و...) ولآتانی تر، مەگەر کەمێک پارەی نەقدی بکەوێنە لایان وساڵی بەسەردا تێپەڕێت، یان هەر بڕە پارەیەک ـ کەم وزۆر ـ خۆیان حەز بکە ن بیدەن، لەوەشە سالآن تێپەڕێت وئەوەندە پارەی نەقدییان نەکەوێتە لا زەکاتی تێدا بێت، چونکە ماڵێک دەڕوات وجۆرێکی تر دێت، بەش خوراویش هەژار وشایستەکانە، ستەم لێ کراویش هەر ئیسلامە. چونکـە ئەو قسانە دەدرێتە پاڵ کتاب وسوننەت...) [1] .

ـ لەمەش سەیرتر ئەوەیە کە خودی شێخ، لە شوێنێکی تردا، کاتێک پرسیاری لێ دەکەن ئایا ئۆتۆمبیل زەکاتی لێ دەکەوێت دەڵێت: ( أما من الناحية الشرعية، فالذين يقولون بوجوب الزكاة التي ذكرتها أنفا يوجبون على كل تاجر ان يحصي العروض التي عنده ويقومها، ثم يخرج من القيمة كما لو كانت نقدا: بالمئة ٢،٥وهذا رأي اكثر العلماء ) [2] .

واتە: لەلایەنی شەرعییەوە ئەوانەی ئەو زەکاتە بە ( واجب ) دەزانن (واتە زەکاتی ماڵی بازرگانی ) دەڵێن پێویستە لەسەر هەموو بازرگانێک ماڵەکانی بژمێرێت وبیکاتە پارەو زەکاتەکەی دەربکات هەروەکو چۆن پارەی نەقد وئاڵتون زەکاتی دەردەکرێت ٢،٥ ٠/٠ ئەمەش ڕای زۆرینەی زانایانە !!

ئەمجا باسی ڕێڕەوی خۆی وڕووکەشییە کان ( الظاهرية ) دەکات و دەڵێت:

( أما المذهب الآخر، فهو لا يوجب هذا النوع من الزكاة لآنه ليس هناك نص في كتاب الله ولا في حديث رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) ولا في شئ من الآثار السلفية الصحيحة أن كل تاجر لا بد أن يقوم بضاعته ويخرج بالمئة 2،5 هذا مجرد رأي واجتهاد واستنباط قائم على مجرد القياس: ويختلف المقاس على المقيس عليه كل الأختلاف ) [3]

---

(1) بڕوانە ( المرجعية العليا فى الاسلام للقران والسنة ) ٢٥٠ـ ٢٥٦ .

(2) بڕوانە ( فتاوى الشيخ الالبانى ومقارنتها بفتاوى العلماء ) ل 366.

(3) هەمان سەرچاوە ل ٣٦٦ .

واتە: ئەمما ڕێڕەوەکەی تر، ئەم جۆرە زەکاتە ( واجب ) ناکات، لەبەر ئەوەی دەقێک نییە لە قورئان وفەرموودەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) یان شوێنەوارێکی ( سافی ) ڕاست بڵێ پێویستە بازرگان سەری ساڵ ماڵە بازرگانێکانی مەزەندە بکات و زەکاتی٢،٥ ٠٠٪ دەربهێنێ ، ئەم قسەیە تەنها ڕایەکی پەتی وکۆشش ( اجتهاد )ێکە لەسەر پێواندن ( قياس ) بنیاد نراوە، لە نێوان دوو شتدا کە زۆر لەیە کتر جیاوازن ( مەبەستی پارەو ماڵی بازرگانییە).

لەم سەردەمەی خۆماندا نامۆترین فەتوا لە بواری ئابووری ئیسلامی دا بەرچاو کەوتووە ئەم فەتوایەی ( شێخ ) بوو، کە بەهۆی شوێن پێ هەڵگرتنی ( ابن حزم )ە وە ڕوناکی بینی، بەو شێوازەش کەلێنێکی گەورە دروست بوو لە شێوەی تێکچوونی تێگەیشتن و ( تصور ) لای هەندێ لە مووسڵمانانی ئەم سەردەمە، بەتایبەتی ئەوانەی توانای لێکۆڵینەوەی زانستییان نییە یان حەز ناکەن بیکەن.! ئینجا لەبەر ئەوەی بزوتنەوەی بازرگانی لەم سەردەمەدا زۆر چالاکە وقۆناغێکی نەوعی گەورەی بڕیوە، بۆیە هاوکات لەگەڵ بەرفراوانی کاری کڕین وفرۆشتن وسەرگەرمیی زۆربەی خاوەن پارەکان بە وە، فەتواکەی شێخ بریتی بوو لە زەنگی ترسناکی لە زەمەنێکدا ـ بەتایبەتی زەکات ـ لە لاوازیدایە. لەلایەکی ترەوە لەبەر ئەوەی شێخ ( ناصر ) قورسایی خۆی هەیە لە گۆڕەپانی زانستی دا وخەڵکانێکی زۆر بە ئەوپەڕی متمانەوە تەماشای قسەکانی دەکەن بۆیە ـ لەڕاستیدا ـ لەتەواوی ڕێز لێنانمان بۆ زانایان ( ابن حزم والشوكاني والالباني) ئەوەیە، کەلەم بوارەدا قسەکانیان قبوڵ نەکەین، بەڵکو قسەی سەرجەم زانایانی ئوممەتی ئیسلام وەربگرین کە پێچەوانەی بۆچوونی ئەو کەسانە بوونە. بەورد بوونەوەش لە مێژووی زانستە ئیسلامییەکان دەبینین زانایان هەرچەند گەورە بووبێتن هەڵەیان هەر لێ وەشاوەتەوە، بۆیە نابێت بڵێین: فلانە زانا چۆن دەبێت قسەی بەر پەرچ بدرێتەوە؟! چونکە تەنها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم

) نەبێت، هەموو کەسێک هەڵەی لێدەوەشێتەوە و نابێت بەلامانەوە سەیر بێت، یان وابزانین ئەوە داگرتنە لە پلەو قەدری. بۆ نموونە: شێخ ( علیش ) کە موفتی هەموو ( مالکـی ) یەکان بووە لە سەرەتاکـانی ئەم سـەدە لە ( میسردا )دا، فەتوای داوە کە پارەی کاغەز ( النقود الورقية ) زەکاتی لێ ناکەوێت. لەبەر ئەوەی نە ئاڵتونە ونە زیوە ونە بە یەکێکیان دا پۆشراوە. بۆیە نەک زەکاتی تیادا نییە، بەڵکو ( ربا ) یشی تیادا ناژمێردرێت گەر مامەڵەی ( فایز )ی پێ کرا [1] .

لەگەڵ ئەوەیشدا کە بێگومان ئەم پارە کاغەزانە هیچ جیاوازییەکیان نییە لەگەڵ ئاڵتون وزیودا، لەبەر ئەوەی هەرشتێک بەو دووانە دەکرێت بەم پارانەش بەهەمان شێوە دەکرێت. ئایا دەکرا هەندێ لە خۆشەویست وهەوا دارانی شێخ ( علیش ) بیانوتبایە ، خەڵکینە بۆتان نییە هیچ تێبینی یەک لەسەر مامۆستاکەمان تۆمار بکەن چونکە زانایەکی گەورەیە!! بێ گومان نەخێر، بەڵکو لە ڕۆشنایی قسەی زانایاندا، هەر کەسێک قسەی سەیر ونەگونجاو بکات لەگەڵ مەبەستەکانی شەریعەتدا، پێویستە بەر پەرچ بدرێتەوە، لە بارەی فەتوای ئەم ناوبراوەشەوە، ئەنجومەنی گەورە زانایانی شانشینی عەرەبستانی سعودی بە زۆرینەی ڕا بڕیاریاندا کە پارەی کاغەز بە هەموو شێوەکانی زەکاتی تێدایە و ( ربا ) یشی تیادا دەژمێردرێت[2]

پوختەی ئەم بەشەی باسەکە مانیش ئەوەیە، زانایانی ئەم سەردەمە بەهەمان شێوە یەکڕا بوونە لەسەر واجب بوونی زەکاتی ماڵی بازرگانی ـ وەکو باسی هەندێ لەو زانایانەمان کرد ـ ئەوەشی کە زیاتر داکۆکی لەسەر نە بوونی زەکات کردەوە لە بازرگانیدا، تەنها شێخ ( محمد ناصر الدين الالباني ) یە، ئەگەر کەسێکی تر هەبوو

---

(1) لەبارەی ئەم فەتواوە، بڕوانە : ( التبيان فى زكاة الاثمان ) محمد حسنين مخلوف، هەروەها کتێبی ( زكاة النقود الورقية المعاصرة ) ل **٢١ـ ٤٩** د. محمود الخالدى.

(2) بڕوانە فەتواکە بە درێژی لە کتێبی ( المبادئ الاقتصادية فى الاسلام ) ل **١٤٧ـ١٥٠** د. على عبدالرسول، بە وەرگرتن لە کتێبی ( زكاة النقود الورقية المعاصرة ) .

بێت یان سەر بە قوتابخانەی شێخ بووە، یان لەبەر ئەوەی کەسێکی ناودار نەبووە لە ئەهلی عیلم ئاوڕ لە قسەکەی نەدراوەتەوە .

**دوا وته :**

له دوای ئەم گەشته بەناو هەندێک لەسەر چاوه كان وقسەی زانایاندا، بەو ئەنجامه گەیشتین كە: زەكاتی سامانی بازرگانی،( العروض التجارية ) (واجب)ه به ڕواڵەتی ئایەتێک له قورئاندا به تایبەتب وچەندین ئایەتی تر كه بەگشتی مەسەله كه دەگرێتەوه، هەروەها به كۆمەڵه فەرمووده وشوێنەوارێک له پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) وهاوەڵانی ڕەزای خوایان لێ بێت، به تایبەتی عومەر وعەبدڵلای كوڕی و ( ابن عباس ) هەروەها بەڕەزا بوونی سەرجەم هاوەڵانی تر بەوەی كه نەیاریان تیانه بووه لەم بارەوه. له پاش ئەوانیش شوێنكه وتووانیان وئەوانەی دوای ئەوان هاتوون ( اجماع ) یان كردووه لەسەر ( واجب ) بوونی ئەم زەكاته، جگه له ڕووكەشی كان ( الظاهرية ) لەم بارەوه كەس ناكۆكی نەكردووه. زانایانی سەردەمیش لەسەر هەمان ڕێبازی پێشینان یەكڕا بوونه لەسەر ئەم مەسەلەیه، جگه له شێخ ( محمد ناصر الدين الالباني ) وكەسانی زۆر كەم لەسەر هەمان ڕێبازی ( داود ) و ( ابن حزم الظاهری )ن .

هەروەها بەوەش گەیشتین كه فەتوای نەبوونی زەكات له سامانی بازرگانیدا، حاڵی نەبوونێكی ترسناكه بۆ واقیعی ئەم سەردەمه و،زیانێكی گەورەیه بۆ ئابووری ئیسلامی له ڕێگەی بێ بەش كردنی هەژاران وبێ نەوایان وموجاهیدان... هتد له فراوانترین وگرنگترین بوارەكانی زەكات كه بازرگانییه .

لەم لێكۆڵینەوەدا یەكێ له مەبەستەكانم ئەوه نەبوو به دوای هەموو ڕاوبۆچوونی زانایاندا بچم وكۆیان بكەمەوه لێره، چونكه نووسینەكه بەو شێوازه تەشەنەی دەكرد ولەو سنوورەی بۆم دانابوو تێپەڕ دەبوو، بەڵكو ئەوەنده بەس بوو كه بڵێم: له ئەنجامی لێكۆڵینەوه و،به دوادا چوون بۆم دەركەوت هەموو زانایانی ئوممەتی ئیسلام بەكۆی ڕا لەسەر ( واجب ) بوونی زەكاتی ماڵی بازرگانی بوونە:-

لەوانەیە کەسێک بڵێت و ـ وترایش ـ کێ دەڵێت حەق بە زۆریی دەناسرێت، مەگەر خوای گەورە نا فەرموویت ( واکثرهم للحق كارهون )! ئەم قسەیەیش لەهەر ڕوانگەیەکەوە تەماشای بکەیت مایەی پەژارەیە، لەلایەکەوە ڕەتکردنەوەی یەکدەنگییە( اجماع )، لە لایەکیشەوە دەمارگیری [1]وخۆشەویستی نابینایە بۆ هەندێکی کەم لە زانایان کە وا گومان دەبەن، (داود وابن حزم ) کە (ظاهري ) بوونە، لەسەر حەق بووبێتن لەوەی کە ماڵی بازرگانی زە کاتی تیدا نییە و، هەموو زانایانی ئیسلام لەسەر هەڵە بن لە کۆن ونوێدا، ئەمەش لێ تێکەڵ بوون و داخستنی دەرگای بیرکردنەوەی پێ دەووترێت، پەنا دەگرین بە خوا لەو سیفەتانە.

ئێمە ئەوەی بەپێویستمان زانی بکرێت ـ لە چوار چێوەی توانای خۆماندا ـ ئەنجاممان دا لە کۆ کردنەوەی بەڵگەکانی زەکاتی بازرگانی وسەفەر بۆ چەندین شار بەدوای هەندێ سەرچاوەدا، لەبەر ئەوەی بانگەواز بۆ ئەم ئیسلامە ئەرکی سەرشانی هەموو موسڵمانانە، ئەم فەتوایەیش ـ کە هەندێک بڵاوی دەکەنەوە ـ کەلێنێکە هەوڵ دەدرێت دروست بکرێت لە ناو زنجیرە کەلێنێکی تردا لەو بوارە جیا جیاکاندا.

تکایشم وایە لای خوای گەورە بە کردەوەیەکی چاک لێمان قبوڵ بکات وبیکاتە قورسایی لە تەرازووی کردەوە کانماندا. ئەگەر هەر هەڵەو کەم وکورتییەکیشی تیادا بێت، لەبەر ئەوەیە مرۆڤین وهەڵە لە سروشتماندایە ،هەر کەسێکیش لە هەر هەڵەیەک ئاگادارمان بکاتەوە بەسنگێکی فراوانەوە وەری دەگرین ـ انشاء الله ـ و ( سبحانک اللهم وبحمدک اشهد الا اله الا انت استغفرک واتوب الیک ) .

[1] لەبارەی دەمارگیری، نووسینێکمان ـ بە عەرەبی ـ ئامادە یە بۆ چاپ بە ناوونیشانی ( التعصب الاسلامی محاولة لتشخيص الخلل وايجاد الحل ).

**ملخص البحث باللغة العربية**

( الحمد لله الذي خلق السموات والأرض وجعل الظلمات والنور ثم الذين كفروا بربهم يعدلون).

وصلى الله على رسوله المبعوث رحمة للعالمين، الذي اوضح الحجة وابان المحجة وترك الامة على مثل البيضاء ليلها كنهارها لايزيغ عنها الا هالك ) .. اما بعد:

فقد أعظم الله المنة على هذه البقعة من ارضه، أن أذن لنور الدعوة الأسلامية ان يبلغها، وهدى جموعا كثيرة من شبابها ليساهموا في تثبيت جدور الصحوة الأسلامية عليها، والتي ضربت باطنابها في سائر المعمورة ومنها بفضل الله منطقتنا، ومما يبشر بغد مشرق يعز الله فيه اولياءه، ويذل فيه اعداءه، ان غالبية الشبيبة المسلمة ـ ههنا ـ يتخذون من طريق سلف هذه الأمة اللاحب نهجا يسيرون عليه، ومن كلامهم نبراسا يستضيئون به، في زمن احلولك فيه الظلام وعظمت المحنة.

اما ما يخص موضوع البحث، فقد آلمني اني رأيت في السنوات الأخيرة فتوى، كانت قد تبنتها ( الظاهرية ) قديما، وبعض اهل العلم من المتأخرين والمعاصرين حديثا، مفادها، عدم وجود الزكاة في العروض التجارية، فاستبشر بذلك مجموعة من التجار المسلمين هنا، وغدوا لا يخرجون زكاة أموالهم الطائلة متأثرين بما اشيع من ذلك الرأي المخالف لأجماع الأمة.

وقد حزمت امري وأزمعت على تقصى كلام العلماء وأرائهم بهذا الصدد، وتعقبت المسألة من مظانها المعتبرة، فوجدت بحمدالله، قد تظافرت الادلة على وجوب الزكاة في العروض التجارية، وتوحدت كلمة العلماء من سلف هذه الأمة الصالحين والسائرين على نهجهم من الخلف على ذلك.

وقد بدا لي ان اكتبه باللغة الكردية، قصدا ورغبة في تعميم الفائدة، كون كثير من الأكراد لا يجيدون اللغة العربية الفصحى بالهيئة المطلوبة، هذا مع أنني اشربت حب العربية في قلبي منذ يفاعة اظفاري ، وكان ذلك من فضل الله علي، وفيما يلى اختصر محتوى هذه الرسالة

ليكون تلخيصا ينوب عن الاصل:

بعد رجوعي الى كثير من المصادر الفقهية وغيرها . قديما وحديثا . والتي الحقت بآخر البحث قائمة باسمائها توصلت الى مايلى:

1. ان كثيرا من المفسرين وعلى رأسهم شيخهم الطبري قد فسروا قوله تعالى ( ياايها الذين آمنوا أنفقوا من طيبات ما كسبتم ) بالتجارة، وقد ورد ذلك عن ( مجاهد ) وغيره، كما ان الامام البخاري جعل احد ابواب صحيحه ( باب زكاة الكسب والتجارة ) مستدلا بهذه الآية الكريمة، مكتفيا بها دون ان يورد حديثا.

2. ما أخرجه ( ابو داود ) و ( الدار قطني ) عن ( سمرة بن الجندب ) رضي الله عنه قوله: ( كان رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) يأمرنا ان نخرج الصدقة مما نعده للبيع، وكذلك ما أخرجه ( الحاكم والدار قطني والبيهقي)من حديث ابي ذر رضي الله عنه عن النبي ( صلى الله عليه وسلم ) انه قال ( في الابل صدقتها، وفي الغنم صدقتها، وفي البز صدقته) وقد تعقبت اقوال المحدثين، او بعض طرقه، فوجدتهم يستدلون بها سلفا وخلفا، منهم قديما ( الحاكم وابن عبد البر والنووي، وابن حجر العسقلاني) وخلق كثير، وسار على ذلك الغالبية العظمى من المعاصرين، منهم احمد شاكر الذي رد على ( ابن حزم ) في تضعيفه لبعض الرواة، والشيخ ( ابن باز ) الذي كثيرا ما يحتج بما صح عن ( ابي داود ) في وجوب زكاة العروض.

وقد نقل الامام النووي في كتاب ( المجموع ) اتفاق جميع الرواة على قراءة ( البز ) وهو متاع البيت في حديث ابي ذر ( وفي البز صدقته ) بالزاء وليس بالراء خلافا لمن اراد التشكيك في ذلك كون الكلمة تعني البر.

3. ما رواه الشافعي واحمد وابو عبيد والدار القطني وابن ابي شيبة وسعيد بن منصور وعبد الرزاق، بعضهم عن ابي عمرو بن حماس وبعضهم عن غيره، أن والد عمرو كان يبيع الادم والجعاب ( الجلد والجفان ) فمربه عمر بن الخطاب فقال له: اد زكاة مالك، فقال له: يا

أمير المؤمنين انما هو الادم، قال قومه، ثم أخرج صدقته ) كما نقل ( ابو عبيد ) بسند صحيح عن ابن عمر قوله: ( ليس في العروض زكاة الا ما كان للتجارة ) وقد صحح الأئمة هذا الاثر بما فيهم الشيخين ابن حزم والالباني، وورد ذلك ايضا عن عبدالله بن عباس، قال ابن قدامة: ( هذه قصة يشتهر مثلها ولم تنكر فيكون اجماعا ) ولم يعرف . قط . احدا من الاصحاب خالف في هذا، فهو اجماع سكوتي كما نبه على ذلك الشيخ الشنقيطي.

4. اجمع العلماء والأئمة في زمن التابعين وبعدهم على وجوب زكاة التجارة، وقد نقل الاجماع على هذا ( ابن المنذر وابو عبيد والخطابي ) وغيرهم، وممن ذكرهم النووي ممن اجمعوا على ذلك: عمر بن عبد العزيز والحسن وطاووس والنخعي والثوري والاوزاعي واسحق والفقهاء السبعة في المدينة والائمة الاربعة وغيرهم كثير، بل لم يعلم مخالف أصلا سوى ما كان من ( داود الظاهري ).

وقد اسهبت . بعض الاسهاب . في جمع ما تسنى لي من اراء العلماء والمحدثين وشراح الكتب على ذلك . دون ان اقصد الاستقصاء، خشية ان تطول الرسالة اكثر مما قدرت لها، ومن المتأخرين ركزت على رأي الامامين ابن القيم وشيخه ابن تيمية، الذي نقلت عنه قوله في القواعد النورانية ((والأئمة الأربعة وسائر الأئمة الا من شذ . متفقون على وجوبها في عروض التجارة سواء كان التاجر ..) اما اراء المعاصرين فقد وجدتها تستعصي على الجمع، لأنهم متبعون ومرددون لكلام السلف الصالح في هذا الموضوع، فهي لا تكاد تحصى لكثرتها وتظافرها، ولعدم شدة الحاجة الى النقل عنهم كون الامر مسبوقا بالاجماع من اساسه، فقد اكتفيت بالاستنارة ببعض فتاوى العلامة ( ابن باز )، ورأي الشيخ ( محمد صالح العثمين )، ثم عرجت على اراء وشروحات مجموعة اخرى من المعاصرين كالمفسر الشنقيطي والشيخ سيد سابق والدكتور يوسف القرضاوي وغيرهم وبعد ان تم لي ما اردت . او ما اكتفيت به . من تعضيد رسالتي باراء وفتاوى اهل العلم من لدن اجماع القرون الخيرية المفضلة والى يوم الناس هذا، أتيت على ذكر شئ من سيرة اول من شذ عن منهج العلماء، بقوله بعدم وجود

الزكاة في العروض التجارية، وهو ( داود بن علي الظاهري ) ت 270 هـ وبينت ان منهجه كان مرفوضا من قبل العلماء، وانه علاوة على شذوذه واخذه بظواهر النصوص دون النصوص الاخرى توضيحا او تقييدا، واهماله لمقاصد الشريعة التي من اجلها شرعت بعض الاحكام وتجريئه العامة على القول في دين الله من عند انفسهم عن طريق فتح باب الاجتهاد، فانه كان يقول بخلق القرآن ايضا، وهذا ما حدا بالعلماء والمحدثين في زمنه ان ينفروا منه ويحذروا المسلمين من شذوذه,حتى ان الامام ( احمد ) رفض لقاءه، رغم محاولات ( داود ) المتكررة لذلك عن طريق صالح ابن الامام احمد، كما ذكرت ان مذهب ( داود ) ماكان له ان يستمر أو يلقى بعض القبول لولا أن ( ابن حزم ) . وكان عملاقا في العلم . قد نذر نفسه فنفخ في جذوته الخامدة، واكثر من الدفاع والمنافحة عن ارائه وبعث الظاهرية . من بعد موات . تارة اخرى بعد ان مررت على موقف الامام ( محمد بن على الشوكاني ) وتلميذه ( صديق حسن خان القنوجي ) مرور الكرام، حيث سارا على طريق ( ابن حزم ) في نفي زكاة العروض على وفاق تام.

وعمدت . أخر الامر . الى رأى أحد ابرز . العلماء المعتبرين في هذا العصر الذين ينكرون وجوب الزكاة في العروض والثروات التجارية وهو الشيخ ( محمد ناصر الدين الالباني ) فنقلت كلامه على وجه التفصيل من كتابه ( تمام المنة في التعليق على فقه السنة ) وأحلت الرد على كلامه الى معاصر له، وهو العالم المتخصص في قضايا الاقتصاد الاسلامي وهو الدكتور (يوسف القرضاوي ) في كتابه ( المرجعية العليا في الاسلام للكتاب والسنة ) فأفاض في بيان مخالفة كلام الشيخ لظواهر الايات الامرة باخراج الزكاة من كل مال، وباغفاله لكثير من اراء السلف الذين فسروا قوله تعالى ( ما كسبتم ) بالتجارة، اضافة الى الاحاديث والاثار والاجماع المنعقد على وجوب زكاة التجارة، الذي اعرض عن الالتفات الى شئ من ذلك. الى أخر الرد الذي اثبته في موضعه من البحث. ولم يفتني أن انوه الى ان ردنا على الشيخ ( ناصر ) في هذا الموضوع، وغيره ان استدعى، على ضوء الادلة واقوال العلماء،

ليس تقليلا من شأنه، ولا هو في ذاته بدع من الاعمال، لبديهة لا تقبل النقاش، وهي انحصار العصمة في كلام الله ورسول ( صلى الله عليه وسلم )، وان البشر مهما علا مبلغ علمهم، واتسع افق تفكيرهم، فانهم معرضون للخطأ والزلل، وليسوا منزهين بحال من الاحوال عن ذلك وان غلب على ظن بعض المحبين هذا المعنى، والعبرة بكثرة الحسنات،وإلا فاحترام الشيخ على رؤوسنا ومحبته في قلوبنا علم الله.

وتكلمت من ضمن ما تكلمت عن ( الاجماع ) وانه ممكن الانعقاد، مع التأكيد على اهميته في حال غياب النصوص القطعية، وبينت ان اجماع امة محمد ( صلى الله عليه وسلم ) . فيه الرشاد، وعلى هذا دلت الاحاديث الموقوفة، بل والمرفوعة، كما ورد عن النبي ( صلى الله عليه وسلم قوله (( لا يجمع الله امتي على الضلالة ابدا ويد الله على الجماعة))، اضافة الى ظواهر كثير من الايات، وقد آثرت ان اجعل ذلك تمهيدا لنفي امكان التفرد بالصوابية من قبل عدة من اهل العلم، هم اما من اهل الظاهر، او متبعون لهم حذو القذة بالقذة، ويكون مخالفوهم سلفا وخلفا قد ضلوا عن حق أبلج لم يفلح في حيازته وادراكه الا ( داود الظاهري ) وآحاد ممن رددوا كلماته، وكانت خلاصة ما ادى اليه البحث من نتيجة: ان العروض التجارية فيها الزكاة لأدلة كثيرة وضافية لا لبس فيها .

والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات ......

وكتبه

ابو محمد احسان برهان الدين

2001/1/25

كردستان العراق /السليمانية/كلار

## نبذة عن المؤلف

- احسان برهان الدين.
- من مواليد1974عراقي كردي من السليمانية/ كلار.
- خريج قسم اللغة العربية بكلية التربية جامعة كركوك.
- خريج المعهد الفني في كركوك.
- مجاز في قراءة عاصم براوويه شعبة وحفص وطالب علم في جمع القراءات العشرة.
- له العديد من المؤلفات المنشورة داخل العراق وخارجها، وعلى المواقع الالكترونية باللغتين العربية والكردية،منها:
- نزار قباني ولوثة الفكر الحداثي في شعره.نارين(دار المعرفة/بيروت)
- بحث عن زكاة العروض التجارية باللغة الكردية.(الطبعة الثانية)
- شرح المقدمة الجزرية باللغة الكردية.مجلد(دار المعرفة /بيروت).
- ترجمة السيرة النبوية للصلابي في مجلدين الى اللغة الكردية. (دار المعرفة/بيروت).
- ترجمة(عهد الخلافة الراشدة) للدكتوراكرم ضياء العمري الى اللغة الكردية.مجلد.(مشروع تيشك لطباعة الكتب).
- ترجمة(صحيح الجامع الصغير) للسيوطى بتحقيق الالباني في مجلدين الى اللغة الكردية.(تحت الطبع في السليمانية).
- ترجمة مسرحية عالم وطاغية للقرضاوي الى اللغة الكردية(تحت الطبع في السليمانية).
- ترجمة(نهاية العالم) للعريفي الى اللغة الكردية.نارين للنشر/طبعة بيروت.
- ترجمة سيرة الشيخ محمد بن عبد الوهاب لابن باز الى اللغة الكردية.
- حواطر عن اللغة العربية باللغة الكردية منشورة في بعض المواقع الاكترونية.
- ترجمة( اليوم الاخر) للصلابي الى اللغة الكردية(تحت الطبع).
- اعداد رسالة مصورة عن مناسك الحج باللغة الكردية طبعت في السعودية وكردستان العراق عدة طبعات.
- اعداد رسالة مصورة عن مناسك العمرة.طبع في كردستان العراق.
- علماء الاسلام من هم وماهي صفاتهم(ترجمة الى اللغة العربية).(مكتب تفسير/اربيل).

ومجموعة اخرى من الكتب والرسائل والمواضيع المطبوعة او المنشورة على مواقع الانترنيت.

## المصادر

1. فتح الباري شرح صحيح البخاري، ابن حجر العسقلاني، دار الفكر.

2. المغني والشرح الكبير، ابن قدامة المقدسي، دار الفكر.

3. الموطا، مالك بن أنس، احياء الكتب العربي، 1951.

4. سنن النسائي، بشرح السيوطي وحاشية السندي، دار الفكر، 1995.

5. مجموع الفتاوى، لشيخ الاسلام أحمد بن تيمية، دار الجيل.

6. القواعد النورانية الفقهية، أحمد بن تيمية، مكتب الشرق الجديد.

7. الكافي في فقه الامام أحمد، ابن قدامة المقدسي، تحقيق: سليم يوسف، دار الفكر، 1998.

8. ( العدة ) حاشية الأمير الصنعاني على كتاب ( احكام الأحكام ) شرح عمدة لابن دقيق العيد، دار الكتب العلمية، 1999.

9. وبل الغمام على شفاء الأوام، محمد بن على الشوكاني، تحقيق: محمد صبحي حسن الحلاق، ابن تيمية، 1416هـ .

10. المجموع شرح المهذب، يحي بن شرف النووي.

11. البداية والنهاية، ابن كثير، احياء التراث العربي، 1997.

12. مجموع فتاوى سماحة الشيخ عبدالعزيز بن عبدالله بن باز، دار الوطن، 1416 هـ .

13. اضواء البيان في ايضاح القرآن محمد الامين الشنقيطي، دار أحياء التراث العربي، 1998.

14. الفقه على المذاهب الاربعة، عبدالرحمن الجزيري.

15. كفاية الاخيار في حل غاية الاختصار، أبوبكر بن محمد الحصيني، دار الذخائر للمطبوعات.

16. زاد المعاد في هدى خير العباد، ابن قيم الجوزية، دار الفكر.

17. عارضة الاحوذي بشرح صحيح الترمذي، ابن العربي المالكي احياء التراث العربي، 1995.

18. فقه السنة، سيد سابق، دار الفكر.

19. المفصل في احكام المرأة والبيت المسلم في الشريعة الاسلامية، د. عبدالكريم زيدان.

20. فقه الزكاة، دراسة مقارنة لاحكامها وفلسفتها في ضوء الكتاب والسنة، مؤسسة الرسالة.

21. الفقه الاسلامي وادلته، أ د. وهبة الزحيلي، دار الكتب العلمية.

22. اختيارات ابن قدامة الفقهية، في اشهر المسائل الخلافية، د. على بن سعيد الغامدي، دار طيبة، 1418 هـ .

23. تمام المنة في التعليق على فقه السنة، محمد ناصر الدين الالباني، مكتبة الثقافة.

24. فقه العبادات، حسن أيوب، مكتبة الشرق الجديد، 1983.

25. موسوعة فقه السلف ( فقه عمر بن الخطاب )، د. محمد رواسي قلعةجي.

26. المرجعية العليا في الاسلام للقرآن والسنة، د. يوسف القرضاوي مؤسسة الرسالة، 1993.

27. منهاج المسلم، ابوبكر الجزائري.

28. تأريخ الفقه الاسلامي محمد على السايس، دار الكتب العلمية.

29. فتاوى الشيخ الالباني ومقارنتها بفتاوى العلماء، عكاشة عبد المنان الطيبي، مكتبة التراث الاسلامي، 1995.

30. الاسلام، سعيد حوى، دار الكتب العلمية، 1979.

31. مناهج الاجتهاد في الاسلام، محمد سلام مدكور، جامعة الكويت، 1972.

32. زكاة النقود الورقية المعاصرة، د. صلاح الخالدي، مكتبة الرسالة، 1995.

33. ( علوم الحديث، عبد الكريم زيدان وعبد القهار داود عبدالله، مطبعة عصام، بغداد، 1988.

34. أشراط الساعة، يوسف بن عبدالله بن يوسف الوابل، دار ابن الجوزي.

35. اتحاف أهل الايمان بدروس شهر رمضان، د. صالح بن فوزان الفوزان، مطابع جامعة الامام محمد بن سعود الاسلامية، 1979.

36. الجامع في طلب العلم الشريف، عبد القادر عبد العزيز.

37. طبقات الفقهاء / الشيرازي، دار القلم.

38. اغاثة للهان من مصائد الشيطان، ابن قيم الجوزية.

39. دروس وفتاوى في الحرم الملكي، الشيخ محمد الصالح العثيمين، اعداد، بهاءالدين بن عبدالمنعم آل دحروج مكتبة الشمس، الرياض، ودار البشير للثقافة والعلوم الاسلامية، طنطا.

40. فقه العبادات، الشيخ محمد صالح العثيمين. اعداد وتقديم، ا. د. عبدالله بن محمد بن أحمد الطيار.

41. المنجد في اللغة والاعراب، دار المشرق، 1978.

## پێرست

پێشەکی ............................................................ ١
پێناسەی ( العروض التجارية ) ........................................ ٦
بەڵگەکانی واجب بوونی زەکاتی ماڵی بازرگانی.............................. ٦
یەکەم : بەڵگەکانی قورئاندا :........................................ ٦
دووەم / لە سوننەتدا:................................................ ٨
سێیەم / یەکدەنگی ( اجماع ) هاوەڵانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم )
وتابیعییە کان وزانایان لە پێشینان وشوێنکەوتوانیان : ........................ ١٠
چوارەم: بەرێگەی پێواندن ( قیاس ) : ................................ ٣٠
رووکەشییەکان (الظاهرية ) و زەکاتی بازرگانی.............................. ٣٥
زانا هاوچەرخە کان و زەکاتی بازرگانی..................................... ٤١
دوا وتە : ........................................................... ٥٢
ملخص البحث باللغة العربية........................................... ٥٤
نبذة عن المؤلف .................................................... ٥٩
المصادر ........................................................... ٦٠